# بەرەو رۆژنامەوانیی مۆدێرن

ئامادەکردن

بەختیار کەریمی



**ناوی کتێب: بەرەو رۆژنامەوانیی مۆدێرن**

– ئامادەکردنی: بەختیار کەریمی

– نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جمال رواندزی

– بەرگ: بەشدار نوری

– سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات

– ژمارەی سپاردن: ٢٠٤

– تیراژ: ١٠٠٠ دانە

– چاپی یەکەم ٢٠٠٦

– نرخ: ١٥٠٠ دینار

– چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

**زنجیرەی کتێب –٨٠– (١٨٣)**

**دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی**

**www.mukiryani.com**

**asokareem@maktoob.com**

**Tel: 2260311**

# ناوەڕۆك

**بەشی یەكەم**

پێناسەكانی هەواڵ ........................................ ٩

**بەشی دووهەم**

بایەخەكانی هەواڵ ........................................ ١٩

**بەشی سێهەم**

چەمكە بنەماییەكانی بواری هەواڵ نووسین ........... ٢٩

**بەشی چوارەم**

رەگەزەكانی هەواڵ ........................................ ٣٩

**بەشی پێنجەم**

شێوازەكانی هەواڵ نووسین ................................. ٥١

**بەشی شەشەم**

مانشێت چییە؟ ........................................... ٦٩

**بەشی حەوتەم**

لیـــــد چییە؟ ........................................... ٩١

# پێشەکی

لەوەتەی مرۆڤ هەیە هەواڵ هەیە، لە هەموو قۆناغەکانی مێژوودا هەواڵ هاوەڵی مرۆڤ بووە، نەك هەر لێی دانەبڕاوە بەڵکو وەك پێویستییەکی ژیاریی خۆی نواندووەو تا ژیانیش ئاڵۆزترو فراوانتربووە هەواڵ بەپێچەوانەوە سادەترو ساناتر رایەڵەکانی دەگەڵ ژیان و مرۆڤ گرێداوە.

ئەم کتێبەی بەردەستت (بەرەو رۆژنامەوانی مۆدێرن)

هەوڵێکی مەعریفیانەی کاك بەختیار کەریمی-یە لە کۆکردنەوەی چەمکی هەواڵ و پێناسەو بایەخ و کاریگەرییەکانی، و هەمدیس شرۆڤەکردنی رۆنینە زانستییەکانی هونەری رۆژنامەوانی مۆدێرنە لەسەردەمی ئەمڕۆدا.

کەریمی دەروازەیەکی رۆشنی لەبەردەم رۆژنامەوان و راگەیاندنکارانی کوردستان خستۆتە سەر پشت کە بەبڕوای من دەکرێ لەم دەروازە رۆشنەوە روونتر لە هونەری رۆژنامەوانی رامێنین. ئەو هونەرەی لە ئان و ساتی خۆیدا قسە لە هەموو شتەکانی دونیا دەکات، نەك هەر قسە دەکات بەڵکو بەردەوام لە هەوڵی بەتاڵکردنەوەی سیحری دونیادایە، تەکنەلۆژیاو لەتەکیشیدا هونەریی رۆژنامەنووسیی سیحری ژیان و ماناو نهێنییەکانی بەڕادەیەك کاڵ کردەوە وەك دەڵێن ئێستا جیهان لە چکۆڵەیی خۆیدا بەدوای مەزنیدا دەگەڕێ..

لە دوماهیدا دەمەوێ بڵێم ئەگەر دوێنێ ژیانی رۆژنامەنووسیمان بەرەچاوکردنی پاساوەکانیشەوە نەشیاوە خۆی لە چەمکە زانستییەکان وەنزیك بخاتەوە، ئەوا ئەمڕۆ



نە ئەم پاساوانە بەهانامانەوە دێن نە دونیاش لەبەر خاتری ئێمە لە خێرایی خۆی کەم دەکاتەوە. کەواتە دونیا لەنێو خێرایی خۆیداو جیهانیش لە نێو بچووکبوونەوەی خۆیدا لێمان دەخوازێ پێڕا بگەین، چۆن پێڕا دەگەین؟.. ئەمە پرسیارێکی گەلێ گرنگەو بەرسڤ گەلێکی هەمەڕاش لە پشتیەوە ئامادەگی هەیە، بەهەرحاڵ بەندە وای بۆ دەچێ ئەگەر بەڕاستە رێگای زانستیی ئەم هونەرە تێنەپەڕین، بەجێ دەمێنین.

کاك بەختیار کەریمی: دەستی خۆش کارێکی وای کردووە بۆ ئەوەی لەم کاروانەدا بەجێ نەمێنین، بەو ئومێدەوە!..

**سالار عوسمان**

**٢٠٠٦/٢/٢١**

**هەولێر**

# پێناسەکانی هەواڵ

ئەبێ رۆژنامەوان لە هەنگاوی یەکەمدا «هەواڵ» بناسێ و بتوانێ لە نێوان ئەو رووداوانەی کە لە جیهان دا روودەدەن، هەواڵ لە غەیرە هەواڵ جیابکاتەوە. یەکەم ئەرکی گرنگ و سەرەکی میدیاکان گەڕان بەدوای زانیاری و هەواڵەکان و گواستنەوەیان بۆ خوێنەرانە و ئەم ئەرکە لە ئەستۆی رۆژنامەواناندایە. یەکەم پلە بۆ ئامادەکردن و بەرهەمهێنانی هەواڵ، وڵامدانەوەی ئەم پرسیارەیە «هەواڵ» چیە؟

بە هۆی بەرفراوانبوونی بیروڕاو بۆچوونەکان سەبارەت بەم پرسیارە، بەشێکی بەرچاوی «ئەدەبی» رۆژنامەوانی بۆ ئەم تەوەرە تەرخانکراوە. سەرەتا ئاماژە بەو پێناسانە ئەدەین کە تائێستا لە لایەن زانایانی بواری رۆژنامەنوسیی (Journalism) سەبارەت بە هەواڵ کراوە و لە ئاکامدا پێناسەیەکی گشتی کە پەسەندکراوی رۆژنامەنووسانی جیهانە شیدەکەینەوە.

## ٢٣ پێناسەی جۆربەجۆر سەبارەت بە «مانای هەواڵ»:

- «فێرناندتروو» سەرۆك و مامۆستای ئەنستیتۆی چاپەمەنیەکانی زانکۆی پاریس، لە کتێبێکدا بەناوی «هەواڵ» دەنووسێ: «هەواڵ بریتییە لە بڵاوکردنەوەی رێك و پێکی رەوتی رووداوەکان و زانیاری و زانستە مرۆڤایەتییەکان و گواستنەوەی بۆچوون و ئەندێشە و بیروڕا گشتییەکان».

پێك هێنەرەکانی هەواڵ لەم پێناسەیەدا، رووداوەکان، شارەزایی و زانیارییەکان، زانستە مرۆڤایەتییەکان و بۆچوون و ئەندێشەکان و بیروڕا گشتییەکانە و مەرجەکەشی بڵاوکردنەوەی رێك و پێکە.

- «ئیرکسی. هوپ وود»ی ئەمریکی بەم چەشنە پێناسەی هەواڵ دەکات: «هەواڵ، یەکەمین ئاگاداری سەبارەت بەرووداوێکی مانادارە کە لە لایەن هەموانەوە سەرەنجی ئەدرێتی».



چۆنایەتی ئەم پێناسەیە، رووداوی مانادارە و کاتێ ئەم «رووداوە مانادارە» دەتوانێ، ببێ بە هەواڵە کە زانیارییە بەراییەکان سەبارەت بەو رووداوە بە جەماوەر بدرێت. لاوازی ئەم پێناسەیە لەوەدایە کە لە کاردانەوەکانی هەواڵ و شوێنگیرییەکانی نادوێت. سەرەڕای ئەمانەش روون نیە کە واتای مانادار بوون چیەو پێوەرەکانی هەڵسەنگاندنی ناناسێندرێن.

- «رۆژە کلووس» مامۆستای مەڵبەندی توێژینەوەی هونەریی بڵاوکراوە گشتییەکان لە زانکۆی بروکسێل، لە کتێبی «هەواڵەکان»دا ئەڵێ: «هەواڵ، باسکردنی سادە و روون و پەتی رووداوە هەنوکەییەکانە».

- «میچل. وی چارنلی دا» مامۆستای رۆژنامەنووسی لە زانکۆی مینسووتای ئەمریکی لە کتێبی «پەیامنێری» Reporting ئەنووسێ: «هەواڵ باسێکی شیاو و کورتکراوە، وردی رووداوێکە، نەك خودی رووداوەکە.»

جیاوازی ئەم پێناسەیە لەگەڵ پێناسەکانی تر ئەوەیە، داکۆکی لەسەر شیاو بوون و ورد و کورت باسکردنی رووداوەکە دەکات، ئەگینا لەگەڵ ئەو پێناسانەی کە هەواڵ بە خودی رووداو دەزانن هیچ جیاوازییەکی نابێت.

- «س. مولبی» نووسەری کتێبی «گەڕان بەدوای هەواڵدا» وەها پێناسەی هەواڵ دەکات: «هەواڵ، خستنە رووی راست و بێ درۆ و بابەتیانەی رووداوە گرنگ و هەنوکەییەکانە کە لە رۆژنامەکاندا چاپ ئەکرێن و لە لایەن خوێنەرانەوە پێشوازی لێ ئەکرێ».

- «و.ج بلایەر»ی رۆژنامەنوسی ئەمریکی لە کتێبی «رۆژنامەنووسی» دا هەر بابەتێکی رۆژانە کە بە هۆی سەرنجڕاکێشبوونەوە، خوێنەران پەسندی دەکەن و لە چاپەمەنییەکاندا بڵاودەبێتەوە  بە هەواڵ ئەزانێ.

- لیل ئەسپنسەری ئەمریکی و نووسەری کتێبی «هەواڵ نووسی» دەنووسێ: «هەواڵ، بریتیە لە هەر چەشنە ئەندێشەو کردەوەیەکی دروست کە لە لای تاقمێکی زۆری خوێنەرانەوە سەرنجراکێشبێت».

- هەواڵ ڕاگەیاندن و باس کردنی ڕووداوێکە، یان ئـەوشـتـەیـە کـە پـەیـامنێر ئەینووسێ.

- هەواڵ بریتیە لە کۆمەڵێ وشەو دەستەواژە کە ڕوودان و بـە ئەنجامگەیانـدنی کارێ ڕادەگەینێ.

- هەواڵ بریتیە لەو زانیارییانەی کە پەیوەندی بەو ڕووداوە هەیە کە ڕوویداوە.

- هەوال ڕووداوێکە کە بڕیارە ڕووبدا.

- هەواڵ مەرج نیە کە هەر باسی ڕووداوی هەنوکەیی بێت.

- هەواڵ باسکردنە لە ڕاستیەکان، بەڵام مەرج نیە هەر ڕاستیەك هەواڵ بێت.

- هەواڵ خودی جەماوەرە. ئەم پێناسەیە لەلایەن هارۆڵد ئاوانس سەرنووسەری پێشوی «ساندی تایمز» و «تایمزی لەندەن» کراوە، نووسراوە.

- پێناسەیەکی دیکەی بە ناوبانگ سەبارەت بە هەواڵ، لە لایـەن **«لۆردنـۆرس کلیفی»** بریتانیایی کراوە، نووسراوە، کلیف کە خاوەنی کۆمـەڵێك میـدیا و دامـو دەزگای ڕاگەیاندنی گشتی بوو لە میانەی ساڵەکانی **١٨٦٩** تا **١٩٢٢**، سـەبـارەت بە هەواڵ ئەنووسێ: «هەواڵ شتێکە کە کەسێ ئەیـەوێ لـە شـوێنێکدا سـەرکـوتی بکات و ئەوەی دەمێنێتەوە، ڕاگەیاندنە».

لەڕوانگەی کلیفەوە، هەواڵ ئەبێ کاریگەر بێت و لە هەمان کاتیشدا بە بۆنـەی پوول و پارەوە چاپ نەکرابێت.

- پێناسەیەکی دیکە کە لە لایەن زۆربەی ڕۆژنامە نووسانەوە پەسەنـد کـراوە، پێناسەی یا من (لە) ڤیلیام گیبرە. ئەو لە ڕوانگەی کۆمەڵناسیی بەرهـەمهێنـانی هەواڵەوە دەبێژێ «هەواڵ ئەو شتەیە کە ڕۆژنامەنووسان چێی دەکەن».

- هەواڵ، ئەنجامی بەکارهێنانی ئەو شێوازانەیە کە ڕۆژنامـەنووسـان کـەڵکـی لێـوەردەگـرن. ئـەمـە پێناسـەی مـارك فیـشمەنـە، کـە دەرهاوێـشتەی ڕوانـینی کۆمـەڵناسانە بۆ بەرهەمهێنانی هەواڵ.



- هەواڵ، هەوێن و ماکی سەرەکی ڕۆژنامەیە.

- هەواڵ، بەرهەمی جیهانی ڕامیـاری و کۆمـەڵایـەتییـە، کـە لـەو بوارانـەدا زانیاری بە دەستەوە ئەدات. ئەمە پێناسەی **گرووپـی میـدیایی گلاسـکۆیە** و بـەم پێیە هەواڵ خاوەن شێواز و ئەندێشەیە. لەم ڕوانگەیەوە هەواڵ دەنگدانەوەی جیهـان نیە بەڵکو ڕواڵەت بەخشی جیهانە هەواڵ بە شێوازیکی کۆمەڵایەتـی پێـك دێـت و تەنیا ڕاستەقینە کۆمەڵایەتـییـەکـان و ڕاسـتیە ئـەزمـونییـەکـان بـێ لایەنانـە بڵاوناکاتەوە، بەڵکو کاریگەری لەسەر پێکهێنانی کۆمەڵگای ڕاستەقینە هەیە.

- کۆمیسیۆنی نێونەتەوەیی بەدواداچوونی بابەتـەکانی پەیوەنـدیکردن کـە بـە کۆمیسیۆنی (مەك براید) ناسراوە، لە ڕاپۆرتەکەیدا سەبارەت بە هـەواڵ دەنوسـێ: هەواڵ ئەبێ بـە خێرایـی و دوابـە دوای قـەومـانی ڕووداوە کـە بڵاوبێتـەوە و بـۆ هەمووانیش سەرنجراکێش بێت و هەڵگری زانیاری نوێی بێت و کاریگـەر بێـت، لـە هەمان کاتیشدا تایبەتمەندییەکانی کەلتوری کۆمەڵگا، بڵاوبکاتەوە».

هەروەك بۆمان دەرکەوت، هەریەك لەو پێناسانە گرنگی بە بابەتێـك ئـەدات و ئەوجۆرەی کە شیاوی وشەی هەواڵ بێت، شی کردنەوەکان لـەو پێناسـانەدا توانـای خستنە ڕووی تەواوی لایەنەکانی هەواڵیان نەبووە. هـەربۆیـە، لێـرەدا ئامـاژە بـە پێناسەیەکی گشتی دەکـەین کـە پـەسـەنـد کـراوی زانایـان و کارناسـانی بـواری ڕۆژنامەنووسیە و دوایین و تۆکمەترین پێناسەی هەواڵە تا ئێستا.

*** هەواڵ ڕاپـۆرتێکی بابـەتیانـە و ورد و بـێ لایـەنـی، ڕاسـتەقینـەکـان و ڕووداوەکانە:**

- لێرەدا مەبەست لە «ڕاپۆرت»، مانا تەکنیکییەکەی نیە. بەڵکو مەبـەسـت خستنە ڕوو و پیشاندانی زانیاری و شارەزایی سەبارەت بە دیاردەیەکی تایبەتـییـە کە خوێنەران ئاگاداری نین.

– مەبەست لە «بابەتی» بوونی هەواڵ ئەوەیە کە پەیوەندی بە جیهانی زەینەوە نەبێ، واتا سەبارەت بە ئاوات و خۆزگەو خولیا و هیواکانەوە نەبێ، بەڵکو لە جیهانی مادیدا بوونی هەبێ.

– بەهۆی بەرپرسبوونی ڕۆژنامەنووس بەرامبەر بە کۆمەڵگا، پێویستە ئەو زانیاری‌یانەی پێشکەشی دەکات لەباری بەهرەمەند بوون بە ڕادەی ڕاستی و دروستی لە ئاستێکی باوەڕ پێکراووبەرزدا بێت.

– بە چ شێوەیەك دەتوانین بێ لایەنی بپارێزین؟ لە هیچ شوێنێکی جیهاندا بێ لایەنی نیە. تائەوکاتە دەتوانین بێ لایەن بین کە بەرژەوندی نەتەوەیی‌مان لە مەترسیدا نییە.

– جیاوازی نێوان ڕاستەقینەو ڕووداو. هەموو ڕۆژێ خۆر لە ئاسماندا دەبینین. ئەمە بۆ خۆی ڕاستیەکە. ئێستا گەر بێتو ڕۆژێ خۆر لە ئاسماندا نەبێت. ئەم حاڵەتە نائاسایی‌یەو دەتوانێ ببێ بە ڕووداو. پێویستە بڵێم کە ڕووداوەکان لە ئاکامی پرۆسەیەکی درێژخایەنی زەمەنیدا دەبن بە واقع.

– د. کازمی موعتەمێدنەژاد لە کتێبی «ڕۆژنامەوانیدا» دوای ئەوەی کە حەوت پێناسە سەبارەت بە مانای هەواڵ بە دەستەوە ئەدات، ئەم پێناسەیەی خوارەوە وەکو پێناسەیەکی گشتگیربۆ هەواڵی چاپەمەنی‌یەکان دەخاتەڕوو:

**– هەواڵ بریتیە لە ڕاگەیاندن و پیشاندانی ڕووداوە سەیرەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و گێڕانەوەی بیر و بۆچوون و بیروڕاگشتی‌یەکان.**

**پێنج هۆکاری گرنگ لە پێکهێنانی ئەم پێناسەیەدا دەورییان هەیە:**

١- **ڕاگەیاندنی ڕووداو:** هەر ڕووداوێك بەر لەوەی جەماوەر پێی بزانێ نەناسراوە و تەنیا ئەو کاتە ئەبێتە هەواڵ کە ئاشکرا ئەبێ و بە خەڵکانی تر دەگەیێندرێ.

بەگشتی هەواڵ کارێکی لە ناکاوە و شتە چەسپاو و نەگۆڕەکان لە خۆناگرێ،



ئیدی دوابەدوای پێش هاتنی هەر چەشنە گۆڕانکارییەك لە ئێستادا، یان سەبارەت بە گۆڕانکارییەکانی پێشوو، زانیاریەك بگات، لەم حاڵەتەدا هەواڵێك درووست بووە؛ هەربۆیە ئەبێ بەزووترین کات ڕابگەیێنرێت. بەم جۆرە ئاگادار کردنەوەی خێرای خەڵك لە ڕووداوە تازەکان یان بڵاو کردنەوەی زانیاری نوێ سەبارەت بەو ڕووداوانەی کە پێشتر ڕوویان داوە بە هەواڵ دەژمێردرێن.

بۆ نموونە ئەگەر ئاسەواری قەڵایەکی کۆن بدۆزرێتەوە لەبەر ئەوە دۆزینەوەکە تازەیە و ڕووداوەکە گرنگە، ئەبێ بڵاو بکرێتەوە. هەروەها ئەتوانین بڵێین هەبوونی تەلارێکی پێنج نهۆمی لە تاراندا بابەتێکی ئاساییە و هەواڵ نیە، بەڵام ئەگەر تەلارێکی (٥٠) نهۆمی لەیەکێ لە شەقامەکانی تاراندا دروست بکرێ ئەمە هەواڵێکی تازەیەوە بۆ بڵاوکردنەوە دەشێ.

کەواتە بابەتی هەواڵ شتێکە لە ئێستادا بوونی هەیە و لەچەند ساتی پێشودا بوونی نەبووە، شتێکە لە ناکاو سەری هەڵداوە و دوای سەرهەڵدانی یەکڕاست باسی لێکراوە. بۆیە لە زاراوەی ڕاگەیاندا هەواڵی میدیاکان بە «تازەکان» ناوزەدکراون.

٢- **یەکەمین باس کردن:** بۆ ئاگادار کردنەوەی خەڵك لە ڕووداوە تازەکان، تەنیا ڕاگەیاندنی ڕوودانی ڕووداوەکە بەس نیە، بەڵکو ئەبێ چۆنیەتی ڕوودانی ڕووداوەکەش باس بکرێت بۆ ئەوەی واتا و بەهای هەواڵەکە بناسرێتەوە و وڵامی پرسیارەکانی خوێنەران و گوێگران بداتەوە. هەر بەم بۆنەوەیە دوابەدوای ڕاگەیاندنی هەر ڕووداوێ، بەخێرایی شانۆی ڕووداوەکە و هەل و مەرج و هۆکارەکانی شی ئەکرێتەوە و ئەو کەسانەی کە تێیدا بەشداری‌یان کردووە، دەکەونە ژێر کاریگەرییەوە و ئەناسێنرێن. بۆ نموونە، باس کردنی خۆ کوژی سەرۆکی دایەرەیەك بە تەنیا بەس نیە، بەڵکو ئەبێ هۆکارو چۆنیەتی ڕوودانی ڕووداوەکەش ئاشکرا بکرێت.

٣- **رووداوی بابەتی (Objective)**. هەواڵ هەرساتێ راستەقینەیەکی بابەتی دەگێڕێتەوەو گەر رووداوێك روونەدا، هیچ چەشنە هەواڵێکی پێك نایەت. هەربۆیە تەنیا ئەو رووداوانە ئەکرێنە هەواڵ کە راستەقینەو حەقێقی بن و لە خەیاڵ و فەنتازیا دوور بن. ئەبێ ئەوە بزانین کە ئەو بابەت و چیرۆکە فانتازیانەی وەکوو نۆڤلێت رۆمان کە لە هەندێ لە چاپەمەنییەکاندا بڵاودەکرێنەوە، تەنیا بە ئامانجی سەرگەرمی خەڵکی بڵاودەبێتەوە و لەگەڵ رۆڵ و ئەرکی سەرەکی دامو دەزگای راگەیاندنی گشتی کە رۆڵی هەواڵی‌یە، یەك ناگرێتەوە. بەم پێیە «بابەتی» و راستەقینە بوونی رووداوەکان، گرنگترین یاسای رێکخستنی هەواڵەکانە. بەپێی ئەم یاسایە پەیامنێر نابێ لە ناوەرۆکی ئەو رووداوەی کە باسی لێدەکات، بچوکترین دەستێوەردانی ببێ و لەو پەڕی بێ‌لایەنییەوە باس لە راستیەکان بکات.

خستنەرووی سەرچاوەکانی هەواڵ، پشت بەستن، بە وتەکانی قسەبێژانی رەسمی و بیروڕای کۆرگەلی جێباوەرو شارەزا، هەموی بەمەبەستی بەرێوەبردنی رەگەزی راستەقینە بوونی هەواڵ بە ئەنجام دەگات.

٤- **سەرنج راکێشبوونی هەواڵ**: وەك باسمان کرد، راستەقینە بوونی رووداو، لە مەرجە گرنگەکانی هەواڵە، بەڵام مەرجی تەواو نیە و ئەبێ سەرەڕای راستەقینە بوون، مەرجی سەرنج راکێشبوونی رووداوەکەش، لەبەر چاو بگیرێ. سەرنج راکێشی رووداویش لە لایەن خەڵکەوە دیاری ئەکرێت و هەر لەبەر ئەمەشە پەیامنێری راگەیاندنەکان داخوازی و حەزی خوێنەران و گوێگران و بینەران لە بەر چاو دەگرن و بە پیێ گرنگی رووداوەکانیش بەدوای پەخشی هەواڵەکاندا دەگەڕێن.

دیاریکردنی زەوق و داخوازی ئەو کەسانەی کە سوود لە راگەیاندن ئەبینن، کارێکی ئاسان نیە، هەربۆیە ئەبێ تەنیا ئەو هەواڵانەی کە هەڵبژێردرێن کە زۆرینەی خەڵك پەسندیان دەکەن.

٥- **کۆمەڵایەتی و گشتیبوونی رووداو**: ئەو رووداوانەی کە وەك هەواڵ ئامادە

ئەکرێن، ئەبێ گشتی بن و کار لە ژیانی کۆمەڵایەتی ژمارەیەکی زۆری خەڵك بکەن. کەواتە ئەو رووداوانەی کە بوون و نەبوونیان وەکو یەك وایە و هیچ کاریگەرییەك لەسەر بارودۆخی گشتی بە جێ ناهێڵن و لەوانەیە تەنیا بۆ کەسێك یان خێزانێك یان دەستەیەك سەرنجراکێش بن، هەواڵ نین. هەر چەندە جاروبار رووداوی ژیانی تایبەتی هەندێ لە کەسایەتییەکان بە هەواڵ ئەژمێردرێن، بەڵام ئەوە لە بەر ئەو پەیوەندییە کە بە ژیانی گشتییەوە هەیەتی. بۆ نموونە مردن یان لە دایکبوون، سەرکەوتن و شکستی کەسێکی ئاسایی کاریگەری لە ژیانی جەماوەر ناکات و بە هەواڵ ناژمێردرێ. بەڵام ئەگەر لە ژیانی کەسێکی ناوداری زانستییان سیاسی، گۆڕانێك رووبدات لە بەر ئەوەی جێگای تێڕوانینی خەڵکە، وەك هەواڵ دەناسرێ و وەك رووداوێکی کۆمەڵایەتی پەخش ئەکرێت. کەواتە کاریگەری ژیانی تایبەتی کەسایەتییەکان پەیوەستە بەو رۆڵەی لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا لەئەستۆیانە.
بەڵام نابێ ئەوە لە بیر بکەین، ژیانی تایبەتی کەسەکان بە بێ لەبەرچاوگرتنی پلەوپایەیان ئەبێ رێزی لێبگیرێ و نابێ لە بەر حەز و ئارەزووی خوێنەر و گوێگر و بینەر ژیانی کەسێ بخرێتە مەترسییەوە و ئاسایشیان لێ تێك بدرێ.

بە شیکردنەوەی ئەو خاڵانەی کە باسمان کرد، ئەتوانین بگەینە ئەو ئەنجامانەی کە هەواڵنێر ئەبێ لە تێڕوانینە راستەوخۆکانی خۆی و بە پشتبەستن بەچاوپێکەوتنەکانی خەڵکانیتر، هەواڵی رووداوەکە باس بکات و لە هۆکار و کاریگەرییەکانی بکۆڵێتەوە. بەم جۆرە راستەقینەبوونی هەواڵەکە و سەرنجراکێشبوونی، وەك سیفەتە گرنگەکانی هەواڵ، رەچاو ئەکرێن.

# بایەخەکانی هەواڵ

## بایەخی هەواڵ چیە؟

رۆژانە سەدان و هەزاران رووداو لە جیهاندا روودەدەن، کە زۆربەیان بە هۆی خاڵی بوون لە بایەخی پێویست نابێتە هەواڵ. بۆیە؛ نیازمان بە هەندێ پێوەر هەیە کە بتوانین هەواڵ لە غەیرە هەواڵ جیابکەینەوە. ئێستا ئەم پرسیارە دێتە کایەوە کە ئەم پێوەرانە لە کوێن؟ لە دڵی رووداوەکەدان یان لە هەست و دەروونی رۆژنامەنووسدا؟ ئەتوانین بڵێین ئەم پێوەرانە لە دڵی رووداوەکەدان، نەك لە هەستی رۆژنامەنووس، بەڵام ئەم هەستە دەروونیە باش یارمەتی رۆژنامەنووس ئەدات بۆ دۆزینەوەی پێوەرەکانی هەڵبژاردنی رووداو.

ئێستا شرۆڤەی (شیکاری) ئەو بایەخە هەواڵیانە دەکەین کە لە رۆژنامەنووسیی هاوچەرخدا وەکوو پێوەرگەلێکی شیاو لە سەراسەری جیهاندا بۆ تەواوی رۆژنامەنووسان پەسەند کراوە.

**١- بەرفراوانی** (Impact).

رووداوێ، هەواڵی بەبایەخ و بەرفراوانی تێدایە کە بتوانێ کاریگەر بێت لەسەر جەماوەرێکی زۆر و بەرفراوان لە ئێستا و داهاتوودا. گرنگ نیە کە کارتێکردنەکە نێگەتیڤ یا پۆزەتیڤ، راستەوخۆ بێ یان ناڕاستەوخۆ. بۆ وێنە کاتی هەواڵێ سەبارەت بە گۆڕینی ناسنامەی هاونیشتمانیان بڵاودەبێتەوە، ئەم هەواڵە بایەخی بەرفراوانی تێدایە و چونکە پێوەندی بە سەرجەم خوێنەران، بینەران و بیستەرانەوە هەیە.



**٢- ناوبانگ** (Fame/Prominence).

ئەو کەسانەی کە لە نێو کۆمەڵگادا پلە و پێگەیەکی یاسایی و حەقیقییان هەیە، تەنانەت هەندێ لە شت و مەکەکان کە بە هۆی چالاکی و ناوبانگیەوە لە ئاستی نەتەوەیی و نێونەتەوەیی دا ناسراون، ئەم بایەخەی تێدایە.

رەنگە ناوبانگی (Fame) باری مانایی باش و خراپی تێدا بێ. ئەندامانی کۆمەڵگە، رێکخراوەکانی کۆمەڵ و هەندێ لە شتەکان و بە شێوەیەکی گشتی بوونەوەران و گیانلەبەرانی لە باری ناسراوی و ناو بانگەوە هاوسەنگ نین. کەسایەتییە ئایینی و رامیاری و فەرهەنگی و کۆمەڵایەتییەکان لە لایەکەوە و هەروەها بێ گیانەکان یان رێکخراوە و دایەرە دەوڵەتی وخسووسیەکان لە لایەکی دیکەوە، بە هۆی چالاکی و خزمەتگوازییەکانیانەوە، ئەم بایەخە هەواڵیە لە خۆ دەگرن.

بۆ وێنە مەرگی کەسێکی ئاسایی لەگەڵ کەسێکی ناسراودا، بایەخێکی هەواڵی یەکسانیان نیە. هەر بۆیە بایەخی ناوبانگ (Fame) لە ئاست بێ رۆح و گیانلەبەراندا بە پێی ئەو ناوبانگەوە کە لە نێو کۆمەڵگای جیهانی و نەتەوەییدا هەیانە، دەسنیشاندەکرێت.

سەبارەت بەم بایەخە هەواڵیە روانگەیەکی رەخنەگرانە هەیە کە پێویستە باسی لێ بکرێ. بە پێی ئەم روانگەیە، هەواڵەکان خەڵکی ئاسایی ناگرنەوە چونکو بە ناوبانگ نین. رۆژنامەنووسان تەنیا باس لە سەر ناوداران، ناسراوان و دەسەڵاتداران دەکەن، ئەمە لە حاڵێکدایە کە پاڵەوانی راستەقینە خەڵکن. بە پێی ئەم روانگە ئەو سیمایەی هەواڵەکان لە جیهاندا بە دەستیەوە ئەدەن سیمایەکی راست و تەواو نیە.

جان پیلجێر (John Pilger)، رۆژنامەنووسێکی بەریتانیاییە کە تا ئێستا دووجار خەڵاتی باشترین رۆژنامەنووسی لەو وڵاتەدا بەدەست هێناوە. دوای چەندین ساڵ چالاکی پیشەیی باس لە سەر بایەخدان بە جەماوەر لە هەواڵەکاندا ئەکات و تەنانەت لەو بارەوە کتێبێکی بە ناونیشانی «قارەمانەکان Heroes» بڵاو

کردۆتەوە و بە دیدێکی رەخنەگرانەوە باس لە بایەخی هەواڵی تایبەت بە «ناو بانگ» دەکات.

- *سەرنج بدەنە ئەم نموونەگەلە:*

١- **سەرۆك بارزانی پێشوازی لە سکرتێری گشتی حیزبی زەحمەتکێشانی کوردستان کرد** (گوڵان ساڵی نۆیەم، ژ ٣٩٤. ٨ی ئاب ٢٠٠٢).

٢- **چاوەڕوان دەکرێت بووش شەڕی سێیەمی کەنداو بەرپا بکات.** (گوڵان ساڵی نۆیەم ، ژ٤٠٢، ٥ تشرینی یەکەم ٢٠٠٢).

٣- **شرۆیدەر دەنگی کەمتری هێنا. بەڵام بە راوێژکار مایەوە.** (گوڵان ساڵی نۆیەم، ژ ١. ٤، ٢٦ی ئەیلول ٢٠٠٢).

٤- **دوو کوڕی نەوجەوان شەڕیان بە پۆلیسێکی هاتووچوو فرۆشت.** (گوڵان. ژ ٤٠٣، ١٠ی تشرینی یەکەم ٢٠٠٢).

٥- **ئاگری نەورۆز لە سەر چیای ئاویەر کرایەوە.**

٦- **ئاپارتمانێ لە شەقامی فەرەحی شاری سنە داڕووخا.**

## ٣- کێشە و ململانێ (Confict).

ئەجۆرە رووداوانە، کێشە و ململانێ و ناکۆکی و دژایەتیکردن لە نێوان ئەندامان و گرووپ و نەتەوە و ئاژەڵەکاندا لە سروشت دەگرێتەوە. لێکئالان لەوانەیە بە شێوەی تێکهەڵچوونی دوو هێڵی بەرامبەر بێت یان بە شێوەی عەقڵانی و ئیدئۆلۆژیك.

ئەو هەواڵانەی کە سەبارەت بە دزی، پێکدادان، بوومە لەرزە، لافاو، گەردەلول، شەڕ و ئاژاوە، مانگرتنەکان، ڕێپێوان و کێشە سیاسییەکانن و هتد... لەو جۆرە رووداوانەن کە دەتوانن هێمنایەتی کۆمەڵگا تێك بدەن وکاریگەری نێگەتیڤیان لەسەر ئاسایشی جەماوەری هەبێ.



ئەم رووداوانە، بە هۆی ئەوەی کە ئەگەری ململانێ و کێشە و تێکهەڵچوونی تێدایە، هەموو کاتێ میدیاکان گرنگی پێدەدەن (سەرنجی دەدەنێ). ئەوەشمان لە بیر نەچێ کە ئەم رووداوانە هەندێ جار کارتێکردنی پۆزەتیڤیان هەیە، وەکو پێشبڕکێگەلی وەرزشی.

- *سەرنج بدەنە ئەم چەند نموونەیە:*

**١- ئێران خرایە لیستی تەوەری شەڕئەنگێزانەوە.**

**٢- رێپێپێوانی خوێندکارانی کوریای باکووری دژی ئەمریکا.**

**٣- پێنج هەزار کەس لە ئاکامی بوردمانی کیمیاوی شاری هەڵەبجە شەهید کران.**

**٤- هێرشی تیرۆریستانی (جندالاسلام) بۆ سەر ئاوایی خێلی حەمە و شەهید کرانی ٥٠ پیشمەرگە.**

**٥- رەگەز پەرەستانی بریتانیایی، ئاگریان بەردا کەمپی پەنابەرانی کوردی لە لەندەن.**

## ٤- سەرسووڕ هێنەری و سەیر و سەمەری و نائاسایی و بێ وێنەیی.(Odidity).

هەر رووداوێ کە سەیرو سەمەر و نا ئاسایی و سەرسووڕهێنەر بێ، ئەم بایەخە هەواڵیەی تێدایە. ئەم رووداوانە بە پێچەوانەی پێش بینی و چاوەڕوانیەکانی ئێمە رووئەدەن.

بۆ وێنە: دزی شتێکی نائاساییە، بەڵام سەرسووڕ هێنەر نیە. رەنگە شێوە و چۆنیەتی دزیکردن سەرسووڕ هێنەر بێت. دۆزینەوەکان و داهێنانەکان ئەو رووداوانەن کە ئەم بایەخە هەواڵیەیان تێدایە.

- *سەرنج بدەنە ئەم چەند نموونەیە:*

**١- هەزاران قورپۆق هێرشیان کردە سەر شاری مەریوان.**

**٢- رادەی منداڵانی گوندنشینیێ لە تورکیا، گەیشتە ٤٠ کەس.**

**٣- دێرینـە ناسـانی ئـەمریکـی رایانگـەیانـد کـە ئێـسکی دایناسـۆرێ کـە هەڵدەگەڕێتەوە بۆ ١٤٠ ملیۆن ساڵ لە مەوپـێش، لـە رۆژئـاوایی ئـەم وڵاتـە دۆزراوەتەوە.**

**٤- ژنێکی ٩٠ ساڵان لە هیندستان، منداڵێکی بوو.**

### ٥- گەورەیی و فراوانی:

ئەم بایەخە هەواڵییە پەیوەندی بە رادە و ئامـارەوە هـەیـە. گـرنگ نیـە ئـەم رادەیە چ بێت، بەڵکو هەرچەندە رادەکە زۆرتر بێ بایەخی هەواڵی پتر پێدەدرێ. بـۆ وێنە گەر لە رووداوی پێکدادانی ئۆتۆمۆبیلێدا ٥٠ کەس گیانیان لە دەسـت بـدەن، لە چاو رووداوێکی دیکەی لەم چەشـنـە کـە ٢ کـەس بکـوژرێن، رووداوی یـەکـەم پتانسیەلی زۆرتری هەیە کە ببێ بە هەواڵ.

- **سەرنج بدەنە ئەم چەند نموونەیە:**

**١- ٧٠ کەس لەئاکامی پێکادانی دووپاس لە رێگەی مەریـوان – سـنە گیانیـان لەدەستدا.**

**٢- تۆفانی ئاندرۆ لە فیلادێلفیا، یەك ملیارد دۆلار زەرەری بە جەماوەر گەیاند.**

**٣- تیمی تۆپی پێی برازیل لە یاریگەی بارسیلۆنا بە ئەنجامی (١٣-٠) لـە تیمـی تۆپی پێی ئارژانتینی بردەوە.**



### ٦- نزیکایەتی، نزیك بوون، نزیکی (Proximity):

جەماوەر هەموو کاتێ هەوڵ ئەدات کە ئاگاداری ئەو رووداوانە بـن کـە لێیـان نزیکە و پەیوەندی بەوانەوە هەیە. هەر بۆیە رەنگە رووداوێك بۆ جەماوەری شـارێك یان ناوچەیەك هەواڵ بێت و سەرنجی بدەنێ، بەڵام بۆ ناوچەیەکی دیکـە بـێ بایـەخ بێت. بایەخی هەواڵی نزیکی بە دوو شێوە بۆ خوێنەران هەڵگری بایەخی هەواڵییە. یەکەم: جوگرافیایی، دووهەم: واتایی (معنوی). نزیکی جوگرافیـایی وەکـو شـار و وڵات و ناوچەی نزیك بە رووداوەکە. بـۆ وێنـە خوێنـەران پێیـان خۆشـە سـەرەتا ئاگاداری رووداوی پەیوەندار بە شار و وڵاتی خۆیان بن تاکو شـوێنی دیکـە. واتـا هەتا مەودای رووداو لە شوێنی ژیانی خوێنەران، بینەران و بیستەران دوورتر بێـت، لایەنی بایەخی هەواڵە کە کەم دەبێتەوە.

نزیکـی واتـایی وەکـو: وێکـچونە فـەرهـەنگـی، بـاوەڕی، رەگـەزی و کۆمەڵایەتی‌یەکان. رووداوێك کە لە شوێنێکی دووردەست رووی دابێت لە حاڵێکدا وەکو هەواڵێك خاوەن بایەخە تا رادەیەك پەیوەندی بە زمان، فەرهـەنـگ، بـاوەڕ و هۆگریەکانی دیکەی خەڵکەوە هەبێت یان بە واتایەکی دیکە خاوەن بایەخی نزیکـی واتایی (معنوی) بێت.

- *نزیکی جوگرافیایی*

**١- یانەی کورد لەشاری سنە دامەزرا.**

**٢- کرانەوەی پیشانگای تەراحی لەبانە.**

**٣- فیلمی «ایست بانك» لە سنە دروستکرا.**

- **نزیکی واتایی:**

١- **کوردەکانی ئاڵمانیا ڕێپێوانی دژی شەڕیان بەرپاکرد.**

٢- **کچە کوردێ لە ئەمریکا، خەڵاتی باشترین ڕۆژنامەنووسی پێ بەخشرا.**

٣- **ژنەکوردێ لە سوید بوو بە ئەندامی پارلەمانی ئەو وڵاتە.**

## ٧- نوێبوون Timelyness:

نوێبوونی هەواڵ لە ڕۆژنامەکاندا پێگەیەکی بەرچاوی هەیە. تا ڕۆژنامە هەواڵی نوێ و تازەی تێدا بێت، بەردەنگی فراوانتر دەبنەوە. بێگومان تەواوی ڕۆژنامەکان لەم بوارەدا لەگەڵ یەکتردا پێشبڕکێیان هەیەو هەوڵ ئەدەن نوێ ترین هەواڵ بۆ خوێنەرانیان بڵاوبکەنەوە. خێرایی لە بواری بڵاوکردنەوەی هەواڵی تازە، ئەبێتە هۆی ئەوەی کە خوێنەران نیازیان لەباری هەواڵەوە تێربێت و لەسەرچاوەی دیکە ئەگەڕێن. هەڵبەت هەندێجار دەرکەوتن و ئاشکرابوونی لایەنی شاراوەی هەواڵێکی کۆن، لە باری تازە و نوێ بوونەوە، نرخی ڕووداوەکە بەرزدەکاتەوەو دەتوانرێ بۆ بەرەنگەکان بڵاوبکرێتەوە.

ئەم حەوت بایەخە بۆ ناسین و هەڵسەنگاندنی نرخی هەر ڕووداوێك بەکار دێت و لە لایەن ڕۆژنامەنووسانەوە گرنگییەکی تایبەتی هەیە. سەبارەت بە بایەخەکانی هەواڵ فیلپ گایار یوهانگاڵتۆنگ و مری روگ بیروڕای جیاوازیان هەیە و بە شێوەی زانستیانە لە بواری بایەخەکانی هەواڵدا لێکۆڵینەوەیان کردووە کە وەکو سەرچاوەیەکی جێی متمانە بۆ لێکۆڵەرانی بواری پەیوەندییەکان بەکەڵکە. سەرەڕای ئەمانە، پێویست دەکات کە ڕۆژنامەنووسان شارەزای ئەم حەوت بایەخەبن و لە نووسینی هەواڵەکاندا لە بەر چاوی بگرن.

## چەمکە بنەڕەتییەکانی بواری هەواڵ نووسین

هەر هەواڵێ کە لەرێگەی دامودەزگای ڕاگەیاندنی گشتییەوە بڵاو دەبێتەوە، هەڵگری چەند تایبەتمەندی گرنگە کە ئەبێ لە سەرەتای قۆناخی کۆکردنەوەی زانیاری سەبارەت بە ڕووداو تاکو قۆناخی خستنەرووی هەواڵ لەبەرچاو بگیردرێ. لێرەدا باس لە هەشت (٨) چەمك یان تایبەتمەندی کە پێویستی هەواڵ نووسینە، دەکەین.

### ١- دروستبوونی هەواڵ:

گرنگترین تایبەتمەندی هەواڵ، ڕاستی‌یەکەیەتی. ئەگەر هەواڵەکان لەگەڵ ڕاستییەکاندا یەکنەگرنەوە و بەدروستی نەنووسرێنەوە، متمانەی خەڵك لە دەستئەدەن.

واتە لە کاتی گەڕان بە دوای هەواڵدا، پەیامنێر ئەبێ بێ لایەنانە سەیری ڕووداوەکان بکات. ئەوەی بیستوویەتی یان بینیوویەتی بە شێوەیەکی ڕاستگۆیانە بیخاتەروو، دەبێ بە هیچ جۆرێك پێش دڵنیا بوون لە بابەتێك، هەواڵ نەنووسێ.

ڕۆژنامەنووسە ئاماتۆرەکان زۆرجار هەواڵی ناڕاست بڵاو ئەکەنەوە. ئەوان زۆرجار بەشە نەزانراوەکانی ڕووداوێك بە پێی بۆچوون و گریمانەکانی خۆیان دادەنێن، تەنانەت لە نادروستی هەواڵەکەیان شارەزایی‌یان نیە.

نووسەرانی لاویش هەندێجاری، گریمانە و خەیاڵی خۆیان ئەخەنە پاڵ ڕووداوەکەو زیادەڕەوی ئەکەن. بۆ ئەوەی خۆیان وتەنی «هەواڵی سەرسووڕ هێنەر» دروست بکەن. گەرچی لەوانەیە زانیاری گریمانەیی و خەیاڵ خستنە پاڵی ڕووداوەکان بەرگێگی سەرنجراکێش بکاتەبەر هەواڵی ڕووداوەکە، بەڵام گرنگی هەواڵ لە پلەی یەکەمدا لە ڕاستییەکەیدایە، نەك لە سەرنج ڕاکێشی‌یەکەیدا، ئەگەر وابێ گوێگرو خوێنەرو بینەران لە جیاتی ئەو هەواڵانە دەرۆن ئەو ڕۆمان و چیرۆکانە ئەخوێننەوە



کە لە ڕووی سەرنجراکێشییەوە ناوبانگیان هەیە.

ئەبێ بزانین هەندێ جار لە نێوان خێرایی و دروستی هەواڵەکاندا کێشە دروست ئەبێ، چونکە هەندێ جار ڕێ ئەکەوێ، هەواڵنێرەکە لە بەر خێرایی و پەلە کردن لە ناردنی هەواڵەکەیدا تووشی هەڵە دەبێت و ڕاستی ڕووداوەکەی بۆ نادۆزرێتەوە. ناچارن ئەو هەواڵانە بەدرۆ بخوێننەوە.

نابێ هیچ پەیامنێرێك بە بیانووی پەلەکردن هەواڵی نادروست ئامادە بکات. چونکە ڕاستی هەواڵەکە لە پێش خێرا ناردنەکەیەتی، هەر بۆیە پەیامنێر ئەبێ لە پاڵ خێرایی و پەلە کردندا ئاگاداری ڕاستی هەواڵەکانی بێ و پاش دڵنیا بوون لە دروستی هەواڵەکان، ڕەوانەی میدیای بکات، هەندێ جار ئەگەر پەیامنێر نەیتوانی دڵنیایی تەواوی دەست کەوێت. ئەوکاتە ئەبێ هەواڵەکە بە «ئاگایی»ەوە بڵاو کاتەوە. ئەم دەستە واژانەی خوارەوە بەڵگەی ڕاستگۆیی هەواڵەکان نیشان ئەدەن: «سەرچاوەیەکی ڕەسمی و ئاگادارو ڕێپێدراو، سەرچاوەیەکی ناڕەسمی. کەم ئاگا، هەواڵێکی پشت ڕاست نەکراو». «بەپێ قسەی مسافرەکان» و ... تاد.

### ٢- ڕوونی و نامۆ نەبوونی هەواڵ:

دەقی هەواڵ ئەبێ لەوپەڕی ڕوونی و سانایی‌یەوە بنووسرێت. بێ گومان هەواڵنێرێ کە نەتوانێ زانیاری و بابەتەکان بەزمانێکی پاراو و ڕەوان و بێ هیچ چەشنە هەڵەیەك بنووسێ، قەد ناتوانێ لە پیشەی هەواڵنێریدا سەرکەوتووبێت. دەستەواژە زانستی‌یەکان وەکو دەستە واژەگەلی بواری پزیشکی، کیمیا، ماف و ... ئەبێ بە جۆرێ بنووسرێ. کە هەمووان لێی تێبگەن. هۆکارگەلی جۆربەجۆر دەبنە مایەی خراپ تێگەیشتن لە هەواڵ کە ژمارەیەك لەوانە لە دەست خودی هەواڵنێر نین. لە نووسینگەکاندا خێرایی تێپەڕینی زەمان هەموو کاتێ ڕۆژنامەنووسان دەخاتە ژێر پاڵەپەستۆ و گوشارەوە. هونەری هەواڵنێر لەوەدایە کە

بتوانێ لە کورتترین ماوەدا زانیاری دروست بەدەست بێنێ و بە باشترین شێوە ئامادەی بکات. ئەگەر بۆ نووسینی هەواڵی رووداوێك دوو رۆژ یان زیاتر کات تەرخان بکرێت، ئاشکرایە کە کەم وکوڕی کەمتری تێدا بەدی دەکرێ. گرنگ ترین هۆکار کە دەبێتە هۆی رووننەبوونی هەواڵ و جوان تێنەگەیشتن لە مەبەستی هەواڵەکە، لەلای خودی هەواڵنێرە.

هەڵبەت ئەم گرفتە بە خوێندنەوەی زیاتر، پرسیاری دووبارە لە سەرچاوەی هەواڵ و پێداگری بۆ تێگەیشتنی مەبەست، چارەسەر دەکرێت. لە راستیدا ئەگەر هەواڵنێر بەجوانی لە هەواڵەکە تیٚبگات دەتوانێ خوێنەریش تیٚ بگەیێنێت.

### ٣- کامڵبوونی هەواڵ:

هەواڵ ئەبێ کامڵ بێت و هەموو زانیارییە پێویستییەکانی بۆ خەڵك دابین بکات. هەر چەند سەرەتای راگەیاندنی هەواڵەکان ئەو کارە ئاسان نیە.

بەڵام هەواڵنێر ئەبێ هەموو توانای بخاتە کار بۆ دۆزینەوەی زانیاری پێویست. هەواڵنێر ئەبێ بۆ کامڵکردنی هەواڵەکەی سەرەڕای ئەوەیی کە ئەبێ هەوڵ بۆ دۆزینەوەی رەگەزەکانی هەواڵ بدات، ئامادەی وڵامدانەوەی پرسیارە لاوکییەکان بێت سەبارەت بە هەواڵەکە. بۆ گەیشتن بەم مەبەستەش ئەبێ خۆی لە جێی خوێنەر دابنێ و دوای نووسینەوەی هەواڵەکە، دیسانەوە چاوخشاندنێکی ببێ و بۆ ئەو پرسیارانەی کە لای خۆی دروست دەبن، وڵامی شیاو بدۆزێتەوە. کەڵك وەرگرتن لەو زانیاریانەی کە ئەرشیڤکراون و یان ئاماژە کردن بە «پێشینەی هەواڵ» زۆر جاران یارمەتی بە کامڵبوونی هەواڵ دەگەینێ.

### ٤- گرنگی هەواڵ:

گرنگی هەواڵ پێوانەیەکی دیاریکراوی نییە و لەگەڵ گونجان و شوێنی رۆژنامە کە (پایتەخت و ناوەندی پارێزگا، شارۆچکەکان). جۆری رۆژنامەکە (هەواڵی ـ



سیاسی ـ رۆژانە ـ هەفتانە...) جۆرو بارودۆخی خوێنەران (رووناکبیر، کرێکاران، شارنشین، گوندنشین ...) ئەگۆڕدرێ. ئەو هەواڵانەی کە لە لاپەڕەی هەواڵی رۆژنامەکاندا پەخش ئەکرێت، بۆ ئەو خوێنەرە ئاساییانەی شارەکان کە رۆژنامە بۆ سەرگەرمی ئەخوێننەوە گرنگیان هەیە. کەچی هەر ئەم خوێنەرانە ناتوانن سوود لەو لێکۆڵینەوە ولێکدانەوانە وەربگرن کە تەنیا روناکبیران و خوێنەرە باڵاکان ئەیخوێننەوە.

بەشێوەیەکی گشتی ئەبێ بوترێ تەنیا لەبەر ئەمەشە، ئەو رۆژنامانەی کە خوێنەرەکانیان بریتین لەچین و توێژە جیاوازەکانی کۆمەڵگا، هەوڵ ئەدەن لەرێی ئامادە کردنی لاپەڕەو ئستوونی جیا جیاوە هەموو کڕیارەکانیان رازی بکەن. دیاریکردنی گرنگی هەواڵەکانیش وەك زانینی حەزو ئارەزووی خوێنەرەکان لە کاری رۆژنامەنووسیدا گرنگییەکی زۆری هەیە.

### ٥- کورت و پڕمانا بوونی هەواڵ:

هەواڵ ئەبێ کورت و پڕمانا بێت، بۆ ئەوەی خوێنەر لە کورتترین ماوەدا سوودی لیٚوەربگرێ. هەواڵنێر ئەبێ بە لەبەر چاوگرتنی توخمەکانی هەواڵ بە کەمترین وشە ناوەرۆکی هەواڵەکەی بخاتەروو.

### ٦- هەمە جۆر بوونی هەواڵ:

هەواڵ ئەبێت ڕەنگاورەنگ و هەمە جۆر بێت بۆ ئەوەی خوێنەران کە سەلیقەی جۆربەجۆریان هەیە سوودی لیٚ وەرگرن و حەزەکانی خۆیانیان تێدا بدۆزنەوە. هەر چەند رەنگاوڕەنگی هەواڵ لە سیفەتەکانی هەواڵ نیە، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی بە سیفەتی تێکڕای هەواڵەکانی دەزگا راگەیاندنەکان دەژمێردرێ. تا هەواڵەکان لە رۆژنامەیەکدا، زیاتربن، خوێنەری زیاد ئەکات و ئەگەر هەواڵەکان یەك شێوە بن،

خوێنەر زوو هیلاك دەكات و ئیدی گرنگی پێنادا. هەر لەبەر ئەمەشە ئێستا ڕۆژنامەكان لە ڕێگەی بڵاوكردنەوەی لاپەڕەو ستوون و ڕەنگی جیاجیاوە سەرنجی خوێنەران بە لای خۆیاندا رادەكێشن و وڵامی داخوازی و پێداویستییەكانی خوێنەرە جیا جیاكانی كۆمەڵگا ئەدەنەوە.

### ٧- نوێ بوونی هەواڵ:

هەواڵ ئەبێ تازە بێت. زاراوەی «تازە» لە زمانە ئەورووپییەكان ـئینگلیزی و فەرەنساـ بۆ هەواڵ بەكار دێت Nouvelles News. باشترین سیفەتی هەواڵ تازەییەكەیەتی. هەواڵ، وەك سەوزە و میوەیە، ئەگەر لە كاتی خۆیدا نەخرێتە بازاڕەوە ئەگەنێ و كڕیاران چیتر نایكڕن. لەبەر ئەمەشە، دەزگا ڕاگەیاندنەكان هەوڵ ئەدەن تازەترین زانیاری لە سەر ڕووداوەكانی ڕۆژ، پێش ئەوەی لە شوێنێكی دیكەدا بڵاو بكرێتەوە بۆ خۆیان دەس پێشخەری بكەن و بڵاوی بكەنەوە.

«ئادرین هبرارد» سەرنووسەری ڕۆژنامەی Letemps كە پێش شەڕی جیهانی دووهەم لە فەرەنسا لە چاپ ئەدرا، بە هاوكارانی دەگوت: ئەبێ بزانن ڕۆژنامەیەك لە ماوەی ٢٤ سەعاتدا پێویستە ئامادە و چاپ بكرێت و بفرۆشێت و بخوێنرێتەوە و فەرامۆشیش بكرێت». هەندێ جار بڵاو بوونەوەی هەواڵ لە كاتی خۆیدا ئاسان نیە و ساڵ و مانگ دوائەكەوێ، بەڵام هەر كە هەواڵە كە ئاشكرا بوو. سیفەتی تازەیی هەیە، چونكە پێش بڵاو بوونەوەی، خەڵك ئاگاداری ڕووداوەكە نەبوون.

ئەمە گرنگی خێرا بڵاو كردنەوەی هەواڵ نیشان ئەدات. دەكرێ بڵێین لە دنیادا هیچ شتێك بەقەد كاری ڕۆژنامەنووسی پێویستی بە خێرایی نییە.

### ٨- سەرنجراكێش بوونی هەواڵ:

لە كاتی گەڕان بەدوای هەواڵدا بێجگە لە تازەبوونی هەواڵ، ئەبێ مەسەلەی



سەرنجراكێش بوونی هەواڵەكانیش ڕەچاو بكرێت. ڕاگەیاندنەكان ئەبێ ڕۆژانە ژمارەیەكی زۆر لە ڕووداوە جیهانییەكان بەرجەستە بكەنەوە، بەڵام ئەم كارە بەكردەوە ئاسان نیە. هەر بۆیە ژمارەیەكی یەكجار كەم بۆ بڵاوكردنەوە هەڵ ئەبژێردرێن. جگە لەوە، هەمـوو ڕووداوە كۆمەڵایەتییەكان بەلای خوێنەرو گوێگرانەوە سەرنج ڕاكێش نین. یەكێك لە هونەرەكانی ڕۆژنامەوانی ئەوەیە بە لەبەر چاوگرتنی كات و شوێن، هەواڵی سەرنجراكێش و جێگەی حەزی خەڵك دیاری بكات. كەواتە ئەتوانین بڵێین هەواڵی سەرنجراكێش ئەو هەواڵەیە كە لە پاڵ نوێبوونیدا بتوانێ سەرنجی خەڵك بۆلای خۆی رابكێشێ.

لە كتێبە ڕۆژنامەنووسییەكانی وڵاتانی ڕۆژئاوادا، كۆمەڵێ پێوەر بۆ دیاری كردنی هەواڵی سەرنج راكێش دانراون، هەر چەندە ئەو پێوەرانە لەگەڵ داب و نەریتی هاووڵاتیانی خۆیاندا ئەگونجێن، بەڵام لێرەدا هەندێكیان وەك نموونە باس ئەكەین:

ڕۆژنامەی دیلی ریپابلیكن Daily Repablican كە لە شاری ماریوسی ویلایەتی ئیلینویزی ئەمریكا چاپ ئەبێ، چەند نموونەیەكی بە هەواڵنێرەكانی خۆیدا بوو تاكو بەپێی ئەو نموونانە هەواڵەكانیان داڕێژن. لەو نموونانەدا پێوەرەكانی هەواڵی سەرنجراكێش بەپێی خواستی ئەو ڕۆژنامەیە دیاری كرا بوون.

ڕۆژنامەی ناو براو بە هەواڵنێرەكانی ڕاگەیاندبوو، كە لە كاتی گەڕان بەدوای هەواڵدا ئەم پرسیارانە لەبەرچاو بگرن.

ئایا كەسێك مردووە؟ زەماوەندی كردووە؟ تەڵاق دراوە؟ تووشی سووتان هاتووە، شاربەدەر كراوە؟ دزی كردووە؟ بووەتە خاوەن منداڵ؟ دوانەی بووە؟ سامانێكی دەست كەوتووە؟ گیراوە؟ لەسەفەر گەڕاوەتەوە؟ ماشێن یان خانووی كڕیوە؟ مانگا یان ژنی دراوسێ كەی دزیوە؟ خۆی كوشتووە؟ لە فڕۆكە كەوتۆتە خوار؟ ڕەدووی لاوێكی قۆز كەوتووە ...

ئەم رۆژنامەیە داوای لە هەواڵنێرەکانی خۆی کردبوو، هەر کات لە هـەواڵێکـی لەم جۆرە ئاگادار ببنەوە بەخێرایی تەلەفون بۆ ژمارەی ٢٢١ بکەن.

جۆرج سی باستین ـ ی ئەمریکایی لە کتێبی «هەواڵەکانی رۆژدا» لە ژێر نـاوی «بیرکاری هەواڵ» ئەم فۆرمولانەی خوارەوەی خستووەتەڕوو:

**مرۆڤێکی ئاسایی + ژیانێکی ئاسایی = سفر**

**مرۆڤێکی ئاسایی + رووداوێکی ئاسایی = هەواڵ**

**مرۆڤێکی ئاسایی + ژنێکی نموونەیی = سفر**

**مێردێك + ٣ ژن = هەواڵ**

**ئەمین سندوقێکی بانك + ژنێك + ٧ منداڵ = سفر**

**ژنێك + پیاوێك + دادگایەك = هەواڵ**

**سەگێك کە گاز لە مرۆڤێك ئەگرێ = سفر**

**مرۆڤێك گاز لە سەگێك ئەگرێ = هەواڵ**

ئەم نمونەی دوایی زۆرجار لە لایـەن قوتابخانـە رۆژنامـە نووسـیـیـەکانـەوە وەك نموونەی هەواڵی سەرنج راکێش باسی ئەکرێ.

**«کاتێك سەگێك گاز لە مرۆڤێك ئەگرێت، رووداوە کە هەواڵ نیە، بەڵام ئەگەر مرۆڤێك گاز لە سەگێك بگرێ هەواڵێکی سەرنج راکێشە».**

**بەڵام ئەوەشمان لە بیر نەچێ گەر سەگێ گاز لە مرۆڤێکـی بـە نـاو بـانگ بگرێ ئەمەش هەواڵە.**

ئەبێ بزانین سەرنجراکێشی هەواڵ لە یەکێکەوە بۆ یەکێکیتر ئەگۆڕێ، چونکە ئەو هەواڵەی بەلای دەستەیەك لە خوێنەرانەوە سەرنجراکێشە لەوانەیە بۆ دەستەیەکیتر ئاسایی بێت. هەربۆیە هەواڵنێرەکان ئەبێ ئەو هەواڵانە بە سەرنجراکێش بزانن کە بەلای زۆرینەی خوێنەرانەوە پەسەندن. کەواتە دیاریکردنی خواست و ئارەزووی خەڵك لە کاری رۆژنامەگەریدا گرنگییەکی تایبەتی هەیە.

## رەگەزەکانی هەواڵ

بۆ ئامادەکردنی هەواڵ، ئەبێ سەرەتا رەگەزەکانی هەواڵ بناسین. ئەگەر گرنگێتی راگەیاندنی رووداوەکان لە بایەخە هەواڵەکاندایە، رەگەزەکانی هەواڵیش نیشاندەری هەواڵەکانن.

هەواڵەکان لە رووی رەگەزەوە تا تۆکمەتر بن، رواڵەتی هەواڵ سەرنجراکێش تر دەبێت و خوێنەر، بۆلای خۆی رادەکێشێ. هەواڵنێری لێهاتوو، بە ئەزموون کاتێ ئەیەوێ هەواڵێك بنووسێ یان ئامادەی بکات رووبەرووی ئەم شەش پرسیارە ئەبێتەوە.

بێگومان ئەم شەش پرسیارە رواڵەتی رووداوەکە سەرنجراکێش و نیاز بە زانیاری زیاتر لە خوێنەردا سەبارەت بە رووداوەکە پاراو دەکات.

**١- کێ (who)** ؟ ئەو کەسە یان ئەو کەسانەی کە لە رووداوەکەدا بەشداریان کردووە یان بە جۆرێك رووداوەکە پەیوەندی بەوانەوە هەیە.

**٢- کەی (when)**؟ ئەو کاتەی کە شوێنی رووداوەکە لە بواری مێژوویی و رۆژ و سەعاتەکەیەوە دیاری ئەکات.

**٣- لە کوێ (where)**؟ شوێنی رووداوەکە لە بواری جێگەو دووری لە جێگاکانی ترەوە دیاری ئەکات.

**٤- چی (what)**؟ بابەت و جۆری رووداوە کەیە، واتە ئەوەی رووداوەکەی لێ پێك هاتووە.

**٥- بۆ (Why)**؟ ئەو هۆکارانەی کە بوونەتە هۆی خولقاندنی رووداوەکە.

**٦- چۆن (How)**؟ چۆنیەتی خەلقی رووداوکە دیاری ئەکات.



**بێ بە فۆنتی مەتن رۆژنامەنووسی رۆژئاوادا بەو شەش رەگەزە بە 5Ws & H ناسراون.**

هەواڵنێری پیشەیی و کارا، کاتێ، ئەیەوێ رووداوێ بکات بە هەواڵ، تێدەکۆشێ ئەو شەش رەگەزەی سەرەوە لە راپۆرتەکەیدا رەنگ بداتەوە. بێگومان لەبەر چاوگرتنی ئەو رەگەزانە هەواڵەکە بە پێزتر دەکات و سیمایەکی گشتی لە رووداوەکە پێشان ئەدات. هەواڵنێر ئەبێ ئەم شەش پرسیارە لە سەرچاوەکانی هەواڵ بپرسێ تاکو بتوانێ هەواڵێکی کامڵ و بێ کێماسی ئامادە بکات.

خاڵێکی دیکە ئەوەیە، لە نێوان رەگەزەکانی هەواڵ و بایەخەکانی هەواڵ پەیوەندی راستەوخۆ هەیە.

کێ ....... ناوبانگی
چی ....... کێشە، ململانێ
لەکوێ ....... نزیکی
کەی ......... نوێبوون

دوو رەگەزی «بۆ» و «چۆن» پێویستی بە شرۆڤە و لێکۆڵینەوە هەیە، چونکە خوێنەران یان بینەران بێخەبەرن لە چییەتی و هۆکاری رووداوەکان.

رەگەزێکی گرنگ کە رۆژنامەنووسان بەپێی تێگەیشتنی خۆیان، لە نێوان رەگەزەکانی هەواڵدا هەڵیدەبژێرن و لە سەرەتای هەواڵدا واتا لید، بەکاری دێنن، بۆ ئەوەی خوێنەران بەرەولای خوێندنەوەی هەواڵ هان بدەن، رەگەزی (Feature)ە، (Feature)، رەگەزێکی ئەوتۆنیە لە هەواڵدا، پێویستە ئەوەش بڵێم کە لە دەقە سەرەکییەکانی زمانی لاتینیدا لە نێوان رەگەزی (Feature) (Feature story) جیاوازی هەیە و بەم جۆرە بابەتانە، دەڵێن: بابەتە پەسەندکراوەکانی مرۆڤ (Humaninterest stpory).

لە کوردیدا کاتێك ئەنووسی «پیاوێك بریندار بوو» ئەو رستەیە لە رووی

ڕێزمانی‌یەوە هیچ کەم و کورییەکی تێدا نیە، بەڵام لەڕووی بوون بە هەواڵەوە کێماسی تێدایە، چونکە پێناسەی کەسەکە و کات و شوێنی ڕووداوەکە و چۆنیەتی ڕوودانی ڕووداوەکە ئاشکرانین.

کە واتە ئەوکاتەی بەدوای هەواڵدا ئەگەڕێی، ئەبێ پێش هەر شتێ بەدوای ڕەگەزە پێك هێنەرەکانی هەواڵەکەدا بگەڕێیی، ئەگینا ڕازاندنەوە و بەکارهێنانی جوانترین شێوازی ئەدەبی بێهودە ئەبێ. هەر لەبەر ئەمەشە لە قوتابخانە و پەیمانگا بەرزەکانی ڕۆژنامەنووسیدا هیچ کاتێك هەواڵ نووسین بە ئامادە کردنی بابەت و شیکردنەوە دەست پێ ناکات، بەڵکو یەکەمین ڕاهێنان بە نووسینەوەی هەواڵێکی کورت دەست پێ ئەکات کە هەموو ڕەگەز و هۆکارەکانی هەواڵ و ئەو پرسیارانەی کە باسیان لێوەکرا بەکەمترین وشەی سفە بە کار بێنین.

*بۆ نموونە: ئەمڕۆ لە گەڕەکی حاجی‌ئاوا منداڵێکی ١٠ ساڵان کاتێ کە لە سەربانی ماڵەکەیاندا گەمەی دەکرد کەوتە خوارەوە بە سەختی بریندار بوو.*
(چونکە دووپشك بریندار ناکا).

وەك ئەبینین ئەم برگەیە بە پێچەوانەی ڕەستەی «پیاوێك بریندار بوو» لەبەر ئەوەی زۆرینەی ڕەگەزەکانی ڕووداوەکەی تێدا دیاری کراوە لە لایەنی هەواڵەوە کاملترە.

ئاشکرایە، لەبەرچاو نەگرتنی هەر یەکێك لەو ڕەگەزانە، هەواڵەکە بە تەواوی ناخاتەڕوو، بۆیە هەواڵنێر ناچارە هەردەم لە خۆی بپرسێ: کێ لە ڕووداوەکە بەشداری کردووە؟ کەی ڕووداوەکە ڕووی داوە؟ شوێنی ڕووداوەکە لە کوێیە؟ جۆری ڕووداوەکە چییە؟ چۆن ڕووداوەکە ڕووی دا؟ بۆ ڕووداوەکە ڕووی دا؟ لێرەدا ئەگەینە ئەو ئەنجامەی کە دەستکەوتنی هەواڵ لە خودی پرسیارەکاندایە.



**١- کێ (who)؟**

کاتێ کە هەواڵێك ئەنووسین، ئەبێ بە باشی ئاگادار بین لەوەی کە چ کەس یان کەسانێ لە خولقاندنی ڕووداوەکەدا بەشداریان کردووە. بەدەستهێنانی تەواوی زانیارییەکان، یارمەتی هەواڵنێر ئەدات بۆ ئەوەی وەڵامدەری نیازی خوێنەران لە زانیاری سەبارەت بە بکەری ڕووداوەکە بێ.

پێویستە هەواڵنێر هەر لە سەرەتای کۆ کردنەوەی زانیارییەکان، ناو، نازناو، تەمەن، پیشەو شوێنی نیشتەجێ بوونی خولقێنەر یان خولقێنەرانی ڕووداوەکە دەستنیشان بکات.

خاڵێکی گرنگ ئەوەیە، کاتێ ئەتوانین ناوی کەسێ لە سەرەتای هەواڵەکەماندا بێنین کە ئەو کەسە بەناوبانگ بێت و بەخێرایی بۆ خوێنەران بناسرێتەوە، گەر کەسەکە ناوبانگ نەبوو، باشتر ئەوەیە کە سەرەتا ئاماژە بکەین بە کارو پیشە و پێگەی و دواتریش ناوی بنووسین.

ڕەگەزی «کێ» هەروەك لە باسی بایەخی هەواڵی ناوبانگی باسمان لێکرد، هەموو کاتێك مرۆڤ نیە یان گیانلەبەران ناگرێتەوە، بەڵکو لەوانەیە بێ ڕۆح و شتەکانیش بگرێتەوە. لەهەر حاڵدا، ڕەگەزی «کێ» بە مانای چ کەسێ یان چ شتێکە.

- **سەرنج بدەنە ئەم چەند نمونەیە:**

**A- کێ (چ کەسێ) (کەسی ڕاستەقینە):**

**١- چل هەزار منداڵ لە ساڵی ڕابردوو بە تاوانی دزی لە تورکیا قۆڵ بەستکران.**

**٢- ئیمپراتۆری ژاپۆن بە بۆنەی چل و حەوتەمین ساڵڕۆژی کۆتایی پێهاتنی شەڕی جیهانی دووهەم، بە دەرکردنی پەیامێ لەیاد و بیرەوەرییەکانی کوژراوانیدا ڕێزی لە کوژرانی ئەم شەڕەگەت.**

**٣- سەرۆك وەزیری هیندستان لە دیدار لەگەڵ بەرپرسانی سووریا، خوازیاری**

**زیادکرانی ڕادەی ئەندامانی هەمیشەیی ئەنجومەنی ئاسایشی سەربە ڕێکخراوەی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ناوچەی ئاسیابوو.**

**B- کێ؟ (چ کەسێ). (کەسی حقوقی):**

**١- پەرلەمانی موسڵمانانی بریتانیا ڕەخنەی گرت لە سیاسەتەکانی ڕەگەزپەرەستانەی ئەم وڵاتە، دژ بە موسڵمانان.**

**٢- سێ بەشگەی کەمپیوتەری ئەمریکا بە شێوەی هاوبەش، کەمپیوتەرێکی نوێیان خستە بازاڕەوە کە لە چاو نموونەکانی پێشو، کارامەیی زیاتری هەیە.**

**٤- وەزارەتی کشت و کاڵ یاسای‌یەکی نوێی بۆ سپاردنی زەوینی دەیمەکێڵ بە وەرزێران پەسەند کرد.**

**C- کێ (چ شتێ):**

**١- سمیناری لێکدانەوەی گیروگرفتی ڕۆژنامەنووسان لە شاری هەولێر دەستی پێکرد.**

**٢- شەمەندەفەرێ کە هەڵگری مەوادی سوتەمەنی بوو لە ڕێگای تاران ـ ئەهوازدا تەقیەوە.**

**٣- فڕۆکەیەکی ١١٦ کەسی، لە سەر ئاسمانی بەغدا کەوتە خوارەوە و ٦٠ گەشتیار لێ کوژرا.**

هەروەك دیتمان ڕەگەزی کێ تەنیا کەسی حەقیقی و حقوقی وەکو بکەری ڕووداوەکە ناگرێتەوە بەڵکو ئەم ڕەگەزە، بە شێوەیەکی گشتی بێ گیانیش ئەگرێتەوە.



**٢- لە کوێ (Where).**

ڕەگەزی «لەکوێ» شوێنی ڕووداوە، و دۆخی ڕووداو لە بواری جێگەو دووری لە جێگاکانی تر دیاری ئەکات.

هەر ڕووداوێ لە بواری شوێنەوە، بۆ خوێ جێگای دەرکەوتنی هەیە. ڕەگەزی «لە کوێ» بەهۆی ئەوەی کە شوێنی قەوماندنی ڕووداوەکە دیاری ئەکات گرنگی هەیە. هەروەك لە باسی بایەخەکانی هەواڵدا ئاماژەمان کرد، ڕەگەزی «لەکوێ» لە بواری نزیکیەوە بە دوو شێوەی جوگرافیایی و مەعنەوی‌یەوە ڕوو ئەدات. لە هەندێ حاڵەتدا ڕووداوێ کە لە شارێ یان وڵاتێکدا ڕوو ئەدا لە چاو ڕووداوێکی قەوماو لە ولاتێکی دیکەدا بۆ خوێنەران گرنگی زیاتر هەیە. هەر بۆیە پێویست دەکات کە ناوی ئەو گەڕەك و کۆڵان و ژمارەی خانووەی کە ڕووداوەکەی تێدا قەوماوە لە هەواڵەکەدا بنووسرێ. بەڵام لە گوند و شارۆچکەکاندا پێویست بە ناوی گەڕەك ناکا، چونکو لە گوندێك یان شارێکی بچووکدا خەڵکەکە یەکتری ئەناسن.

- *سەرنج بدەنە ئەم چەن نموونەیە:*

**١- سلێمانی – ئاژانسی هەواڵی کوردسات:**

**تەقینەوەی بۆمبێ لە نزیکی دامو دەزگای چاپی سەردەم لە شەقامی بەختیاری، ٤ کوژراو و ١٥ بریندراری لێکەوتەوە.**

**٢- سنە – ئاژانسی هەواڵی ئیسنا:**

**گەڵاڵەی کارەباگەیاندن بە ئاوایی شوێ سەربە شارستانی بانە دەستی پێکرد.**

**٣- کامپالا (ئوگاندا). ئاژانسی فەرەنسا:**

**مامۆستایانی خوێندنگەکانی کامپالا و دەورووبەر بۆ زیاد کردنی مووچە و کەم کردنی سەعاتی کار و کەڵك وەرگرتن لە وانەی پسپۆڕی مانیان گرت.**

### ٣- کەی. چ کاتێ (When):

لە نێوان بابەخەکانی هەواڵدا زەمان یان تازەیی هەواڵ گرنگیەکی تایبەتی هەیە و ئەبێ کاتی رووداوی هەواڵەکە لە بڕگەی یەکەمدا بنووسین. بە شێوەیەکی گشتی ئەبێ کاتی رووداوی هەواڵەکە بۆ خوێنەران روون کەینەوە، ئەمەش لە حاڵەتێکدایە کە تازەیی هەواڵ گرنگی‌یەکی تایبەتی ببێ. گەر بێتوو رووداوەکە پەیوەندی بەرابردووەوە بێت و هۆکاری زەمان گرنگی نەبێ پێویست ناکات لە سەرەتای هەواڵەکەماندا کاتەکەی بنووسین.

رەگەزی «کەی» کاتی رووداوەکە دیاری ئەکات. لێرەدا ئەبێ بزانین لە بەر ئەوەی لەسەرووی رۆژنامەکاندا بەروار دیاری ئەکرێت، لە دەقی هەواڵەکەدا زۆر جار دوێنێ یان ئەمڕۆ ئەنووسرێ. بەڵام گومان لەوەدا نیە ئەگەر هاتوو روووداوەکە چەند رۆژێك پێشتر رووی دابوو، بەڵام تازە ئاشکرا بوو بێ، واتا لایەنی نوێتری لێ دیار بوو بێت و بایەخی زەمان گرنگی ئەوتۆی ببێ، پێویستە سەعات و رۆژ یان هەفتە و مانگەکانیش باس بکرێن. لە هەندێ هەواڵی گرنگ دا لەوانەیە چرکە ساتەکانی رووداوەکەش بۆ خوێنەران سەرنج راکێش بێت.

**- سەرنج بدەنە ئەم چەن نموونەی خوارەوە:**

**١- کاتژمێری ٨ و ٣٥ دەقە و ٤١ چرکە. سەر لە بەیانی ئەمڕۆ سێ شەمە، ساڵی نوێی کوردی دەس پێدەکات.**

**٢- حکومەتی هەرێمی کوردستان ئەمڕۆ رایگەیاند کە: هەڵبژاردنەکانی شورای رێبەرایەتی عێراق، حەوتەی داهاتوو بەرێوە دەچێ.**

**٣- حەوتەی داهاتوو، کاتی بەرێوەچوونی تاقیکاری خوێندنگەکانی ناوەندی بە قوتابیان رائەگەیێنرێت.**

**٤- لە ئەنجامی پێکادانی ئۆتۆمۆبیلێ لە جۆری سواری و ماکێك هەڵگری سوتەمەنی لە رێگەی دیواندەرە – سەقز رۆژی رابردوو چوار کوژراوی لێ کەوتەوە.**



### چی؟ (what):

ئەم رەگەزە باس لە ناوەرۆك و بابەت و جۆری رووداوەکە ئەکات و لەگەڵ رەگەزی «کێ» لە گرنگترین رەگەزەکانی هەواڵ دێنە ئەژمار. رەگەزی «چی» رەنگە سەبارەت بە پێکدادانی دوو ترۆمبێل، ئاور گرتن و پەسەندکردنی یان رەتکردنەوەی بڕیارنامەیەکی یاسایی‌یان کرانەوەی کارخانە و سەفەر یان هەرشتێ کە پەیوەندی بە ناوەرۆك و جۆری رووداوەکەوە ببێ هەیە. ئەگەر رەگەزی «چی» لەسەرەتای هەواڵدا بنووسین، هەواڵەکەمان سەرنجراکێش دەکات. هەواڵ نووس ئەبێ بزانێ کە لە نێوان ئەو بابەتە رەنگاورەنگانەی کە هەواڵێك دروست ئەکەن ئەوەیان کە گرنگییەکی تایبەتی هەیە بنووسێ. چونکە ئەگەری ئەوە هەیە کە لەیەك هەواڵدا چەند رەگەزی «چی» بوونی ببێ.

### ١- بۆ (Why) و چۆن (How):

رەگەزی «بۆ» ئەو هۆکار و ئەنگێزانەی کەبوونەتە هۆی رووداوی رووداوەکە دەخاتەروو و رەگەزی «چۆن» لە شێوە و چۆنیەتی رووداوی رووداوەکە باس دەکات. ئەم دوو رەگەزە لایەنەکانی توێژینەوە و شیکردنەوەی رووداوەکان روون دەکەنەوە. ئەم دوو رەگەزە زۆرجار ئاوێتەی شێوە روانین و روانگەو شێوە بیرکردنەوەی هەواڵنێران دەبێت و ئەو شتەی کە سەبارەت بە بێ لایەنی و بابەتیانە بوونی هەواڵە باسی لێدەکەن، لەم دوو رەگەزەوە سەرچاوە دەگرێت.

بۆ وێنە: **سەرنج بدەنە ئەم پرسیارە. هۆی پێکدادانی ترۆمبێلەکان چی بوو؟**

رەنگە رۆژنامەنووسێ هۆکارەکەی لە خێرایی لەرادەبەدەری ترومبێلەکە بزانێت. ئەویتر لەبەرچاو نەگرتنی رێنوێنی‌یەکانی پۆلیسی رێگا وەك هۆکاری پێکادانە کە بزانێت. رەنگە تەواو ئەو هۆکارانە کاریگەریان ببێ. رۆژنامەنووسی پیشەیی و کارا لە دۆخێکی ئاواهیدا هەوڵ ئەدات تاکو کاملترین و تەواوترین

زانیاری له برگەی یەکەمی هەواڵ یان مانشێتەکەدا بنووسیێ و سەرنجی خوێنەر بەرەو لای خوێندنەوەی هەواڵ رابکێشیێ.

رەگەزەکانی «بۆ» و «چۆن» بۆ ئەو هەواڵ و راپۆرتە هەواڵیانەی کە پێویستی بە شیکاری، لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی زۆرتر هەیە بە کار ئەهێنرێن، چونکو لەم جۆرە راپۆراتە هەواڵانەدا رۆژنامەنووس دەرفەتێکی زۆرتری هەیە بۆ لێکدانەوەی هۆکار و ئەنگێزەو چۆنیەتی رووداوەکە.

- *چەند نموونە یەك سەبارەت بە رەگەزی «بۆ».*

**١- وەشتی تەرزە لە پارێزگای کوردستان، زەرەرو زیانێکی گەورەی بەهاوشاریان و وەرزێران گەیاند.**

**٢- بەهۆی تەقینەوەی کەپسوولێکی گاز، لە ئاوایی کانی دیناری سەر بە شاری مەریوان، دووکەس بریندار بوون.**

**٣- بە بۆنەی ساڵرۆژی ئازاد کرانی کەرکوك کارنەڤاڵێکی گەورەی ئاشتی لەو شارەدا بە بەشداری چینە جۆربەجۆرەکانی خەڵك، بەرێوە چوو.**

**- چەند نموونە یەك سەبارەت بە رەگەزی «چۆن»:**

**١- بە بەشداری سەرۆکی حکوومەتی هەرێمی کوردستان، سبەینێ یەکەمین فستیڤاڵی شانۆی چوار پارچەی کوردستان لە شاری سلێمانی دەس پێدەکات.**

**٢- یەکەمین پیشانگای هەناردەکانی کوردستان، لە میانەی رێورەسمێکدا و بە قسەکانی وەزیری بازرگانی لەسەر چنار، کرایەوە.**

## شێوازەكانی هەواڵ نووسین

شێوازی هەواڵ نووسینی نوێ، نەتەنیا جیاوازی لەگەڵ شێوازەكانی رابردوودا هەیە، بەڵكو لەگەڵ شێوازی وتارنووسی و چیرۆك نووسی دا و ... جیاوازی هەیە. لێرەدا مەبەست ئەوە نیە كە شێوازەكانی هەواڵ نووسین گرنگی زۆرتریان هەیە بەرامبەر بە شێوازەكانی دیكەی نووسین، بەڵكو ئەم خاڵە گرنگە كە، هەر شێوازێ تایبەتمەندییەكی هەیە و لە شوێنی خۆیدا شیاوە كەبەكاری بێنین.

لە پیشەی رۆژنامە نووسیدا گرنگ ئەوەیە كە هەواڵێكی دروست، راست و روون و تەواو پێشكەشی خوێنەران بكرێت. بەڵام ئەوەی كە شیاوترین و باشترین رێگەی گواستنەوەی زانیاری و زانستەكان بۆ خوێنەران كامەیە و رۆژنامەنووس ئەبێ بەچ شێوەیەك زانیارییەكان پێشكەشی خوێنەران بكات، پەیوەندی بە شێوازەكانی رێكخستن و ئامادە كردنی هەواڵەوە هەیە. بۆ نووسینەوەی دەقی هەواڵ چەندین شێوازی جۆراوجۆر پێشنیار كراون، بەڵام بۆ چوونی هەموو شارەزا و پسپۆرانی زانستی راگەیاندن لەم بارەوە یەك نین. هەندێ شێواز هەن تازە دێنە مەیدانەوە بەڵام هەندێكیتر هەن بەرەو لە ناوچوون دەرۆن. ئەوەی گرنگە ئەمەیە بتوانین مۆدێلێك بۆ نووسینەوەی دەقی هەواڵ بدۆزینەوە بۆ ئەوانەی ئەیانەوێ فێری زانستی پەیوەندییە كۆمەڵایەتییەكان بن، سوودی لێوەرگرن. ئەو مۆدێلە زۆر دژوار نیە و ئەوەندەش ئاڵۆزی تێدا نیەو ئەوەی بتوانێ بەزمانی دایكی خۆی بنووسێ، لە توانای دایە ئەو كارە بكات. چیرۆكی هەواڵەكان زۆرجار لەیەك ئەچن، هەر بۆیە ئەتوانین بۆ ئەو شێوە یەكسان و وێكچوانە، شێوازێكی دارشتنی تایبەت بەكار بێنین.

ئامانجی سەرەكی رۆژنامەنووسان ئەوەیەكە، هەواڵێكی راست و روون و بە خێرایی بۆ خوێنەران بنووسن. هەندێ لە خوێنەران كاتێكی ئەوتۆ تەرخان ناكەن بۆ



خوێندنەوەی ئەو هەواڵانەی كە لەگەڵ ژیانیاندا پەیوەندی نیە. خوێنەری رۆژنامەیەك گەر ناچار بێت بۆ زیاتر تێگەیشتن لە هەواڵێك، جارێكیتر بخوێنێتەوە، رەنگە ئیتر سەرنجی پێ نەدات و بەرەولای خوێندنەوەی هەواڵێكی دیكە بڕوات یان لە سەرچاوەكانی دیكەی هەواڵ وەكو تەلەفزیۆن و رادیۆ و سەتەلایت نیازی هەواڵی خۆی تێر بكات. ئەوەمان لەیاد نەچێ ئەگەر ئاگاداری پەیدا كردن لە هەواڵێك كارێكی دژوارو ئەستەم بێت، رێكخستن و نووسینی هەواڵ لە چوار چێوەی شێوازێكی تایبەت دا پڕ ئەستەم و دژوارترە، دژواریەكەشی ئەو كاتە دەرئەكەوێ كە كەسێ بیەوێ ببێتە رۆژنامەنووسێكی لێهاتوو و پیشەیی. ئێوە هەواڵ بۆ ئەوە ئەنووسن كە خوێنەر بیخوێنێتەوە نەك ئەوەی كە تەنیا لە چاپی بدەن. بێگومان خوێنەریش كاتێ هەواڵەكەتان دەخوێنێتەوە كە سەرنج راكێش بێت. ئەم سەرنج راكێشیە كاتێ بەدیدێت، كە بتوانن جل و بەرگێكی نوێ و رازاوە و دڵڕفێن كە هەر ئەو شێوازی هەواڵ نووسینەیە بە قامەتی هەواڵەكەدا بدورن. هەواڵنێری لێهاتوو كەسێكە، بتوانێ خوێنەری باش بناسێ و ئاگاداری ئەوەش ببێ كە شێوازی نووسین لە چاپەمەنی‌یەكاندا جیاوازی هەیە. لێرەدا باس لە چەند شێوازێكی هەواڵ نووسین دەكەین، كە لە چاپەمەنییەكاندا باوە.

### ١- شێوازی هێرەمی بەراوەژو یان سەرو ژێركراو

لە شێوازی هەرەمی سەروژێر كراودا، كورتەیەك لە گرنگترین بابەتی رووداوەكە لەسەرەتادا ئەنووسین و پاشان بە پێی گرنگی و سەرنجراكێشبوونی بابەتەكانەوە، بەشەكانی دیكەی ئەخەینەروو بە جۆرێ كە بەشەكەم بایەخەكان دەكەونە كۆتایی هەواڵەكە. هەر لەبەر ئەمەشە ناوی سەروژێریان لێ ناوە، چونكوو بابەتە گرنگەكان لە خوارەوەی هەرەمەكەیە كە ئێستا كەوتووەتە سەرەوە، بابەتەكانی تریش كەوتوونەتە سەرەوە كە ئێستا لە خوارەوەی لوتكەی هەرەمەكەدایە.

لەم شێوازەدا، گرنگترین بەشی بابەتەکە لە بڕگەی یەکەمدا (لید) دەنووسین و بڕگەکانی دیکە بە پێی گرنگی بەدوای بڕگەی یەکەمدا دێن. ئەم شێوە داڕشتن و پۆلین کردنەی بابەتەکان ئەبێ سەرەڕای پاراستنی پەیوەندی لۆژیکی نێوان بەشەکانی هەواڵ، لە گرنگ ترین و سەرەکیترین زانیارییەکانەوە بەرەو کەم بایەخترین بەشەکانی بابەتی هەواڵ بچێن.

گێڕانەوەیەکی مێژوویی سەبارەت بەم شێوازی نووسینە هەیە کە ئەڵێن، لەسەردەمی شەڕی نێوخۆیی ئەمریکادا، هەواڵنێران لە ڕێگەی تێلگرافەوە هەواڵەکانیان ڕەوانە دەکرد و لەترسی ئەوەیکە نەکا پەیوەندییەکە تووشی دابڕان بێت هەر لەسەرەتا گرنگ ترین و بە بایەخ ترین بەشی ڕووداوەکەیان ڕەوانەی نووسینگەی ئاژانسەکە دەکرد و ئەگەر پەیوەندییەکەیان نەپچڕا بووایە، زانیاریەکانی دیکەییان دەنارد.

ئەمڕۆکە شێوازی هەرەمی بەراوەژوو، باوترین شێوازی نووسینی هەواڵە لە دامودەزگا ڕاگەیاندنە گشتییەکاندا. ڕۆژانە زۆربەی بابەتە هەواڵییەکان، وەکو دیمانەی هەواڵی، سمینار و کۆنفرانسەکان ... تاد بەم شێوازە ئەنووسرێت. ئەوەش بڵێم ئەم شێوازە تەنیا تایبەتی ڕۆژنامەکان نیە، بەروانینێکی کورت بە لاپەڕەی یەکەمی گۆڤار و هەروەها بەشی هەواڵی ڕادیۆ و تەلەفزیۆنەکاندا، بۆمان دەرئەکەوێ وەکو تاقە شێوازی باوی نووسینی هەواڵەکان دەرهاتووەکە هۆکارەکەشی هەڵدەگەڕێتەوە بۆ خێراکردنی ڕەوتی بڵاوکردنەوەی هەواڵ بۆ خوێنەران و بیسەران و بینەرانی میدیاکان.

لە شێوازی نووسینی هێرەمی بەراوەژوودا ئەبێ ئەم خاڵە لە بەر چاوبگرین کە دوای نووسینی بابەتی لیدەکە لە بڕگەکانی دیکەدا زانیاری زۆرتر سەبارەت بە بابەتی لید بخەینەروو، واتا هەر بڕگەیەك سەبارەت بە بڕگەی بەر لە خۆی زانیاری و شیکردنەوەی زیاتر بەدەستەوە بدات بۆ وێنە، ئێوە ئەتانەوێ بابەتی وتوێژ یان



کۆنفرانسێك کە هەڵگری زانیاری جۆربەجۆرە، لەسەر شێوازی هێرەمی بەراوەژوو پێشکەش بە خوێنەران بکەن. زانیارییەکان بە شێوەی E,D,C,B,A نیشان ئەدەین. ئیستا لە نێوان ئەو بابەت و زانیارییانە، گرنگ ترینیان بەپێتی «D» دەست نیشان دەکەین و ئەمانەوەێ لە لیدەکەدا بیاننووسین. لە هەنگاوی یەکەمدا کورتەی گرنگ ترین بابەتەکانی «D» لە لیدەکەدا دەنووسین و دواتر لە بڕگەکانی دیکەدا زانیاری زۆرتر سەربارەت بە «D» کە بە پیتی بچوکی «$d_1$ و $d_2$ و $d_3$» دەستنیشان ئەکەین و بەریز بابەت و زانیاری و شیکردنەوەکانی دیکە وێڕای پاراستن و لە بەر چاوگرتنی هاوسەنگایەتی و پەیوەندی لۆژیکی نێوانیان دەخەینەروو. درێژە بەم شێوەیە ئەدەین تا ئەو جێگایەی دەگەینە بەشە کەم بایەخەکانی هەواڵ.




شێوەی درووستی خستنەرووی بابەتەکان    شێوەی نادرووست و نارێکی خستنە رووی بابەتەکان.

لێکۆڵینەوەکان باس لەوە دەکەن کە ڕادەی خوێنەرانی هەواڵ لەگەڵ ڕادەی پەرەگرافەکاندا پێوەندییەکی پێچەوانەیان هەیە. واتا هەرچی هەواڵەکە درێژتربێت

رادەی خوێنەرانی کەم دەبێتەوە. زۆربەی خوێنەرانی رۆژنامەکان تەنیا مانشێتی هەواڵ دەخوێننەوە. بەڵام خوێنەران بەزیاد بوونی رادەی پەرەگرافەکان، کەم دەبنەوە. روونە، ئەم پەیوەندییە پەیوەندی بە چلۆنایەتی رووداو و چۆنیەتی خستنەرووی هەواڵەوە هەیە.

**- لایەنە پۆزەتیڤەکانی شێوازی هەرەمی بەراوەژوو:**

١- لەلیدی ئەم شێوازەدا، کورتەیەك لە گرنگ ترین بابەتەکان ئەخرێتە روو.

٢- خوێنەران کاتێکی کەمتر بۆ بەدەست هێنانی گرنگترین زانیارییەکان تەرخاندەکەن.

٣- خوێنەر ماندوو ناکات.

٤- خوێنەر بەرەو خوێندنەوەی هەواڵ هان ئەدات.

٥- دەقی هەواڵ بەپێی نرخی بابەتەکان ئەنووسرێت.

٦- بەخێرایی وەڵامی خواست و حەزەکانی خوێنەر بۆئاگاداری لە رووداوەکە ئەداتەوە.

٧- لەم شێوازەدا مانشێت نووسین، ماکێت دارشتن و و هەڵەبڕین بە سانایی ئەنجام ئەدرێت.

٨- باشیەکی دیکەی شێوازی هەرەمی بەراوەژو ئەمەیە کە بە هۆی کورت بوونیەوە شوێنێکی کەم لە رۆژنامەدا دەگرێت و بەم چەشنە جێگا بۆ دانانی هەواڵی دیکە ئەمێنێتەوە.

٩- گەر بڕیار بێت بە هۆی زۆر بوونی بابەتەکەوە، دەقی هەواڵەکەمان کورت کەینەوە دەتوانین ئەو پەرەگرافانەی کە هەڵگری بابەتی کەم بایەخن بە سانایی بسڕینەوە.

١٠- بە هۆی ئەوەی کە سەرەکی ترین بەشی باسەکە، لە پەرەگرافی یەکەمدا دەبێت یا (دەنووسرێت) کاری مانشێت نووسین سانا دەکات.



- د.کازمی موعتەمێدنەژاد لە کتێبی «رۆژنامەگەری» دا سەبارەت بەلایەنە پۆزەتیڤەکانی هەرەمی بەراوەژوو ئەڵێت:

١- خوێنەر بە سەیر کردنێکی خێرای مانشێتی هەواڵ، ئەزانێ هەواڵەکە بەلای ئەوەوە گرنگە یان گرنگ نیە.

٢- گەر هاتوو بابەتی هەواڵ سەرنجی خوێنەرەکەی بۆلای خۆی راکێشا، ئەم شێوازە دەرفەتی ئەوەی پێ ئەدا یەکسەر لەسەر خوێندنەوەی بەردەوام بێت تا ئەو کاتەی خوێنەر حەزی لەزانینی هەواڵەکەیە، داخوازییەکانی دێنێتە دی و بەدوای بابەتەکەدا بڕوات و بێ ئەوەی هیچ مەسەلەیەکی گرنگی لەدەست بچێ.

٣- ئەو هەواڵنێرەی کە ئەرکی ئامادەکردنی بابەتەکەی پێ سپێردراوە، لە رێگەی ئەم شێوازەوە ئەتوانێ لە کاتێکی کەمدا بەپێی گرنگیان ئامادە بکات و بیاننوسێتەوە.

٤- سەرنووسەری رۆژنامە، ئەتوانێ بەئاسانی و پاش خوێندنەوەی چەند پەرەگرافێك بابەتە گرنگەکان بۆ مانشێتی بچووك دیاری بکات.

٥- بۆ دەرهێنەری لاپەڕەکان کار ئاسانی دروست ئەکات و هەرکە بینییان جێگە نابێتەوە، هەوڵ ئەدەن کۆتایی بابەتەکە هەڵگرن و هیچ زیانێکیش بە دەقی بابەتەکە ناگات.

ئەوەی لە شێوازی هەرەمی بەراوەژوو سەرنج راکێشە مەسەلەی خێراییە. خێرایی بۆ هەواڵنێر تاکو بتوانێ بەخێراترین کات بابەتەکەی بۆ خوێنەر ئامادە بکات و تاکو لە چاوخشانێکدا بابەتی جێگەی حەزی و خواستی خۆی بدۆزێتەوە، هەروەها خێرایی بۆ بەرێوەبەرانی تاکو بەخێرایی بڕیار لەسەر بڵاوکردنەوەی مانشێت و تەسمیم کردنی بدەن. هەر ئەم خێراییەش وای لە شێوازی هەرەمی بەراوەژو کردوە کە ببێتە گرنگترین شێوازی داڕشتنی هەواڵی رووداوەکان.

**- لایەنە نیگاتیڤەکانی هەڕەمی بەراوەژوو:**

١- بەهۆی ئەوەیکە کرۆکی باسەکە لە پەرەگرافی یەکەمدا ئەخرێتەروو، رەنگە خوێنەر بەشەکانی دیکەی هەواڵ نەخوێنێتەوە.

٢- ئەو شتەی کە لە لیدەکەدا باس ئەکرێت، لە نێو دەقی هەواڵەکەدا دووپات دەبێتەوە.

٣- کارتێکردنی بیرو بۆ چوونی هەواڵنێر لەم شێوازەدا لەچاو شێوازەکانی دیکە زەقتر دێتە بەرچاو.

٤- هەندێ جار بە هۆی کورت کردنەوەی بابەتەکان لە لایەن سەرنووسەرەوە، بڕێ لە زانیاری‌یەکان لە دەقی هەواڵەکە ئەسڕێتەوە.

**- نموونەی یەکەم:**

**مانشێت:** ئەمڕۆ ئەنجوومەنی حوکمڕانی عێراق رادەگەیێندرێت و یەکەم کۆ بوونەوەی خۆی ئەنجام ئەدات.

سەرچاوەی هەواڵ: «ئاژانسەکان»

***«لید»***

بڕیارە ئەمرۆ یەکشەمە ئەنجوومەنی حوکمڕانی عێراق رابگەیەندرێت و یەکەم دانیشتنی خۆی ئەنجام بدات.

***«پەرەگرافی یەکەم»***

*چەند سەرچاوەیەکی سیاسی عێراقی رایانگەیاند: دوێنێ «پۆل بریمەر» سەرۆکی دەسەڵاتی کاتی هاوپەیمانان لە عێراق بەمەبەستی دانانی دوا وردەکاریی پلانەکانی پێکهێنانی ئەنجوومەنی حوکمڕانی وتووێژی لەگەڵ گەورە سیاست مەدارانی عێراقدا کردووە وتووێژەکانیش لە کۆتایی نزیك بوونەتەوە.*



***«پەرەگرافی دووهەم»***

*ئەو سەرچاوانە ئاماژەیان بۆ ئەوەکرد کە ئەگەر کارو بارەکان بە باشی بەرێوە بچن ئەوا ئەنجوومەنی حوکمڕانی کە لە (٢٥) ئەندام پێکدێت ئەمڕۆ یەکشەمە یەکەم کۆبوونەوەی خۆی ئەنجام ئەدات.*

**- *نموونەی دووهەم:***

***مانشێت:*** شێخی ئەزهەر هەموو هێرشێکی خۆکوژیی مەحکوم دەکات.

*BBC*: «سەرچاوەی هەواڵ»

***«پەرەگرافی یەکەم»***

*شێخ محەمەد سەید تەنتاوی، شێخی ئەزهەر ئیدانەی هەموو جۆرە هێرشێکی خۆکوژی کرد کە تێیدا ئەنجامدەرانی بۆمب بە خۆیاندا دەتەقێننەوە.*

*تەنتاوی کە بە یەکێك لە گرنگترین دەسەڵاتدارانی ئایینی سوننی لە ئیسلامدا دادەنرێت گوتی: ئەو گرووپانەی هێرشی خۆکوژیان ئەنجامداوە بەدوژمنی ئیسلام دادەنرێن.*

***«پەرەگرافی دووهەم»:***

*شێخی ئەزهەر لە وتەیەکیدا لە کۆنگرەیەکی نێو دەوڵەتی بەزانایانی ئیسلام لە کوالالامپوری پایتەختی مالیزیا رایگەیاند: گرووپە ئیسلامی‌ییە توندڕەوەکان بانگەوازی جیهادیان بۆ مەرامی تایبەتی بەکار هێناوە و داوای لە موسڵمانان کردکە دیالۆگ لەگەڵ خۆرئاوا دەستپێبکەن.*

***«پەرەگرافی سێهەم»:***

*لە لایەن خۆیەوە «مهاتمیر محەمەدی» سەرۆك وەزیرانی مالیزیا لەکاتی کردنەوەی کۆنگرەکەدا گوتی: رزگار بوون بە کوشتنی بێتاوانان بەدینایەت.*

## ٢- شێوازی باسکردنی مێژوویی (Chronological):

بە پێچەوانەی شێوازی هەرەمی بەراوەژوو لە شێوازی باس کردنی مێــژووی دا، بابەتەکان بەپێی گرنگایەتی‌یان نانووسرێن، بەڵکو بــەپێــی کــاتی ڕوودانیــان بــاس ئەکرێن. لەم شێوازەدا ڕۆژنامەنووس هیچ چەشنە داوەرییەك ناکات سەبارەت بەوەی کە کام بەشی هەواڵ گرنگە یان گرنگنیە، بەڵکو بەو جۆرەی کە ڕووداوەکە لە باری زەمەنی‌یەوە ڕووی داوە، ئەنووسرێتەوە. لەم شێوازەدا هەواڵەکە بە پێشەکییــەکــی گشتی کە داگری بوارەکان و گشتییەتی بابەتی ڕووداوەکــەیــە دەســت پێــدەکــات. ئەوەشمان لەیاد نەچێ ئەم پێــشەکیــە وەکــو دەروازەیــە بــۆ دەســپێکردنی هــەواڵ و هەڵگری تایبەتمەندی‌یەکانی لید نیە.

خاڵێکی گرنگ سەبــارەت بــەم شــێوازە ئــەوەیــەکــە زیــاتر بــۆ خــستنە ڕووی دانیشتنەکان بەکار دێت.

لە بەر ئەوەی لە شێوازی مێژوویی دا لید نیە، بۆیە بە شێوەیەکی گشتی بەکار هێنانی ئەم شێوازە لە ڕۆژنامە و میدیاکانــدا زۆر بــەکــەمــی بــەکاردێــت و نــابێ هەواڵەکانی ڕۆژ بەم شێوەیە بنووسرێت. لە لاپەڕەی هەواڵەکانی ڕۆژنامە و گۆڤار و حەوتەنامەکاندا، کە ڕاپۆرتە هەواڵی شرۆڤەیی و لێکۆڵینەوەیی چــاپ ئــەکرێــت و هەروها بە هۆی ئەوەیکە خوێنەران کاتێکی زۆرتــر بــۆ خوێندنــەوەی بابــەتــەکــان تەرخان ئەکەن، دەتوانین لە شێوازی باس کردنی مێژوویی کەڵك وەرگرین.






وێنەی ئامادەکردنی هەواڵ بە شێوازی باسکردنی مێژوویی

- **لایەنە پۆزەتیڤەکانی شێوازی باسکردنی مێژوویی:**

١- بابەتەکە بە تەواوەتی باس ئەکرێت.

٢- بە هۆی ئەوەیکە لــە ئامــادە کردنــی هــەواڵ لــەشــێوازی مێــژوویی دا، بابەتەکان وەکو شێوازی هێرەمی بەراوەژوو باس ناکرێت، کاریگەری بیرو بۆچــوونی هەواڵنێر لە بەرجستە کردنەوەی بابەتەکان کەمترە.

- **لایەنە نێگەتیڤەکانی شێوازی باسکردنی مێژوویی:**

١- خوێنەر کاتێکی زۆری پێویستە کە ئاگاداری گرینگ ترین بابەتی ڕووداوەکە بێت.

٢- خوێنەر ماندوو دەکات.

٣- هاندانی خوێنەران بۆلای خوێندنەوەی بابەتەکە بە پێی بــوونی جیــاوازی لــەبــواری ڕادەی تاقەت و کات و خوێندەواریەوە، دژوارە.

٤- هەڵەبڕین و مانشێت نوســین و ماکێــت بــەنــدی ئــەم شــێوازە، بــەهۆی زۆر بــوونی بابەتەکانەوە دژوارە.

**** سەرنج بدەنە ئەم نموونەیە:***

**سلێمانی – ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ:**

لەچوار چێوەی سەردانە رەسمی‌یەکەی مام جەلال و وەفدی هاوڕێی بۆ رووسیا و بایەخدانی حکوومەتی رووسیا بەو سەردانە، وەزارەتی دەرەوەی رووسیا بەیاننامەیەکی سەبارەت بە کۆبوونەوەکەی مام جەلال لەگەڵ «ئیگۆرئیڤانۆڤ»ی وەزیری دەرەوەی رووسیا دەرکرد.

لەچوار چێوەی گفت و گۆکاندا هەر دوولا تەئکیدیان لەسەر ئەوە کردەوە کە دەبێت عێراق سەربەخۆ و یەکگرتوو بێت و رێز لە هەموو نەتەوە و ئایینەکان بگیرێت و دەبێت لە عێراقدا دیمۆکراسیەت و پلۆرالیزمی سیاسی بەرقەرار بێت.

لەمبارەوە «ئیگۆر ئیڤانۆڤ» و جەلال تاڵەبانی لەگەڵ ئەمەن کە بە زووترین کات حکوومەتێکی کاتی لە عێراق پێك بێت و متمانەی تەواوی گەلی عێراقی پێبدرێت و لە لایەن کۆمەڵگای نێو دەوڵەتیەوە پشتگیری و ئیعترافی پێبکرێت و تەحەمولی بەرپرسیارێتی چارەسەر کردنی کێشەی سیاسی و ئابووری بکات لە عێراقدا.

**** نموونەی دووهەم:***

**بانکۆك (تایلەند) – رۆیتێر:**

بەرپرسانی هێڵی فڕینی بولغارستان وتیان: کاتێ کە فڕۆکەی ئێرباس لەجۆری ۳۰۰ی هێڵی فڕینی «جی.اس.اس» لە بانکۆکەوە بەرەوشاری «هوشی مینەی ڤییێتنام» لەحاڵی فڕیندا بوو یەکێ لە مسافرەکان بەزۆرە ملی، دەرگای فڕۆکەکەی کردەوە.

بەوتەی ئەم بەرپرسە، ئەو مسافرە خەڵکی ڤییێتنام بووە و دوای بڵاوکردنەوەی تراکت بەسەر ئاسمانی ڤییێتنام، لە فڕۆکەکە پەڕیوەتە خوارەوە.



بەرپرسانی هێڵی فڕینی بولغارستان رایانگەیاند لەم رووداوەدا هیچ کەسێ تووشی زیان نەبووە.

### ۳- شێوازی باسکردنی مێژوویی لەگەڵ لید:

بۆ نووسینی هەندێ لە بابەتە هەواڵی‌یەکان دەتوانین، شێوازی مێژوویی هاوڕێ لەگەڵ لید کە تێکەڵێکە لە شێوازی هەرەمی بەراوەژوو و مێژوویی بەکار بێنین. لە شێوازی مێژوویی هاوڕێ لەگەڵ لید، سەرەتا کورتەی گرنگ ترین بابەتی رووداوەکە بە شێوەی لید لە پەرەگرافی یەکەمی هەواڵەکەماندا ئەنووسین و دواتریش پاشماوەی رووداوەکە بەوجۆرەی کە رووی داوە، بەپێی کاتی روودانیان بە شێوازی مێژوویی ئەنووسین.

ئەم شێوازی نووسینە تایبەتی رووداوی تراژیك و ئەو هەواڵانەیە کە لە نێوشارەکاندا ئەقەومێن.




*وێنەی ئامادە کردنی هەواڵ بە شێوازی باسکردنی مێژوویی لە گەڵ لید*

رۆژنامەنووسانی پیشەیی لەکاتی بەکار هێنانی شێوازی مێژوویی لەگەل لید، لە هەر چەشنە تەکنیکێکی هونەری وەکو وێنەکێشی، سینەما، چیرۆك نووسی ... تاد کەلك وەرئەگرن بۆتەوەی کە لایەنی دراماتیکی ئەم شێوازە پڕەنگتر بکەن.

لەم شێوازەدا بەکارهێنانی توخمی داهێنان و خولقاندن،رووداوەکە سەرنج راکێش تر دەکات و چێژێکی فراوان بە خوێنەر دەبەخشێ. ئەم توخمانە لە دەیەی ١٩٦٠ لەرۆژنامەنووسیی نوێدا (New Jiurnalism) باوبووە یا (بووەبەباو)، ئەم شێوەیە لەرۆژنامەنووسیدا سەرەتا لە لایەن گۆڤاری «ئێکوایر» بەکار هێنرا و «تام ولف» لەم بابەتەوە دەستی داوتە دارشتنی بیرۆکە. واتا لە شێواز و تەکنیکەکانی چیرۆك نووسین بۆ خستنەرووی رووداوەکان بەشێوەی ئۆبژێکتیڤ کەڵکی وەرگرت. لەراستیدا راستەقینەکانی ئۆبژێکتیڤی رۆژنامەوانی و چیرۆك نووسی لەگەڵ یەك دا تێکەل کرد. لەم مەکتەبە ژۆرنالیستییەدا، هەواڵنێر جەخت دەکاتە سەر کەسایەتی سووژەکان، وت وێژو دیالۆگ و مۆنۆلۆگ و وەسفی سیمای بابەتەکان لە هەموو ئەمانە بۆ بەخشینی سیما و رواڵەتی جوان بەرووداوەکە کەڵك وەر ئەگرێت. هەر لەم بوارەدا نموونەی سەرکەوتوو، بەرهەمەکانی «گابرێیل گارسیا مارکێز»ە کە بەوردبینی و لێهاتوویی ئەزموونی ژۆرنالیستی لەگەڵ ئەزموونی رۆژمانووسیدا تێکەڵکرد.

***نموونەی شێوازی مێژوویی لەگەڵ لیدا:***

***لید***

بکوژانی کورە کوردێکی کرێکار لە شاری کەرەج قۆڵ بەستکران.

***شیکردنەوە (شرۆڤە) رووداوەکە:***

*«محەمەدی رەحمانی» خەڵکی ئاوایی کەڵاتێ کە بۆ بەدەس هێنانی بژێوی خۆی*



*و بنەماڵەکەی لە شاری تاراندا کرێکاری دەکرد، رۆژی **٧٩/٦/١٥** کۆچی هەتاوی لە ئاپارتمانێ لە شەقامی ئەمیرئابادی باکووری کەوتەخوارەوە دەس بەجێ گیانی لەدەس دا.*

*بینەرانی رووداوەکە وتیان «محەمەد» لەگەڵ دوو کوری نەوجوان کە ئاشنای بوون لە نهۆمی دەهەمی ئاپارتمانەکە، تێك هەڵچوون و بووە دەمەقرێیان و لە ئاکامدا ئەو دوو کوورە محەمەدیان خستە خوارەوە.*

***یەکێ لە کرێکارەکان بە نێوی «ناسر ئەمجەدی» کە دۆستی محەمەد بوو وتی: ئەو دوو کورە عەجەمن و ناوی یەکیان حسەین و ئەوتریش تەقیە کە لەم گەرەکەدا نیشتەجێن.***

*«ناسر» سەبارەت بە ئاشنایەتی ئەو دووە لەگەڵ موحەمەددا وتی: ئەو دووە دوکانی مێوەیان هەیەو موحەمەد لای ئەوان شت و مەکی دەکڕی و لەمیانەی ئەم یەکساڵەدا کە محەمەد هاتووچۆی ئەوێی دەکرد، ئەوان ئاگادار بوون کە محەمەد کوردە و سوننییە، هەر بۆیە هەمیشە سووکایەتیان پێ دەکرد. تا ئەوەی رۆژێ پێش رووداوەکە بەتوندی لەگەڵ محەمەددا تێك هەڵچوون و ئەوانیش هەرەشەیان کرد بوو کە دەتکوژین.*

*ئەودوو کوڕە دوای کوشتنی محەمەدهەڵاتبوون بۆ شاری کەرەج و لەماڵی خاڵیاندا خۆیان شاردبووەوە، لە ئاکامدا پۆلیس هەردوویانی قۆڵ بەست کرد و بەدادگای سپاردن.*

### ٤- شێوازی کۆتایی سەرسوورِ هێنەر (Surprise ending):

شێوازی کۆتایی سەرسوورِ هێنەر، بەیەکێ لە شێوازە سەرنج راکێشەکانی هەواڵ نووسین دێتە ئەژمار کردن. لەم شێوازەدا گرێی رووداوەکە لە کۆتایی هەواڵەکەدا ئەکرێتەوەو خوێنەر تووشی سەرسوورمان دەکات. هۆکاری سەرهەڵدانی ئەم شێوازە لە بواری ئەدەبیاتی رۆژنامەوانیدا بۆ وڵامدانەوەی نیازی نوێخوازی

خوێنەرانە. ئەڵبەت ئەم شێوازە بۆ هەرجۆرە هەواڵێ بەکار نایێت. شێوازی کۆتـایی سەرسووڕهێنەر بۆ ئەو رووداوانەی کە لایەنی سەرسووڕهێنەری و دەگمەنی زۆریـان هەیە بەکاردێن.

پێشنیار دەکرێت ئەو رووداوانەی کە هەڵگری بابەتی فراوانن بەم شێوازە نەنووسرێن. بەڵکو شێوازی مێژوویی لەگەڵ لیددا بۆ رووداوی پڕبابەت کە پێویستە بە شیکاری زۆرتر هەیە بەکار بێنرێت چونکو لەم شێوازەدا نووسەر دەرفەتێکی زۆرتری هەیە بۆ خستنەرووی رووداوەکە.

لە شێوازی کۆتایی سەرسووڕ هێنەردا، دەتوانین لە تایبەتمەندییەکانی شێوازی هەرەمی بەراوەژوو مێژوویی لەگەڵ لید کەڵك وەربگرین.

**٥- شێوازی گەڕانەوە بۆ دواوە:**

لەشێوازی گەڕانەوە بۆ دواوە کە بەرامبەر بە شێوازی مێژووییە، دەقی هەواڵەکە بە دوایین بەشی رووداو دەست پێدەکات و دواتر پاشماوە و پێشقەچوونی رووداو ئەخرێتەروو.

ئەم شێوازە زۆرتر بۆ کورتە هەواڵ بەکاردێت.

**د- کازمی موعتەمێدنەژاد لە کتێبی رۆژنامەگەریدا لە لاپەرەی ٨٧ سەبارەت بەم شێوازە ئەڵێت:**

«لەو هەواڵانەی کە لەسەر ئەم شێوازە ئەنووسرێت رەنگە لید بەکار بهێنرێت بەڵام گەر بێتو دوایین بەشی هەواڵ، گرنگ ترین بابەتی رووداو بێت، ئەوا یەکەمین پەرەگرافی هەواڵ دەتوانێ وەکو لید بەکار بێنین.»

لەم شێوازەدا دوای نووسینی لید و دوایین بەشی رووداوەکە، بەشەکانی دیکە لەسەر شێوازی باس کردنی مێژوویی ئەنووسرێتەوە کەئەم شێوە نووسینە سەرەڕای سانا بوونی، نیازی هەواڵی خوێنەرانیش تێردەکات.

- *نموونەی نووسینی هەواڵ بەپێی شێوازی گەڕانەوە بۆ دواوە.*



*لۆنای ١٦، بەبەردی مانگەوە گەڕایەوە سەر زەوی*

*مۆسکۆ- ٢٥ سپتامبەر - هەواڵدەرییەکان -*

*ئاژانسی دەنگ و باسی تاس رایگەیاند کەوا گەشتی ئاسمانی ئۆتۆماتیکی سۆڤیەت «لۆنا - ١٦» لە سەعاتی ٨ و ٥٦ دەقیقەی بەیانی، پێنج شەمە، لە باشوری رۆژئاوای مۆسکۆدا نیشتووەتەوە.*

*گەشتیە ئەلکترۆنیە کە لەو جێگەیەی کە چاوەڕوانی دەکرا و لە پێش چاوی چاوەڕێکەرانی بەچەتری نەجات نیشتەوە.*

*بەم جۆرە یەکەمین ئەرکی چوون و گەڕانەوەی ئەو گەشتیە بۆ سەرمانگ بەسەرکەوتوویی کۆتایی پێهات و لۆنا خەروارێك بەردی سەرمانگی هێنا بۆ سەرزەوی.*

*رۆژی ١٤ سپتامبەر - لۆنا - ١٦ بەبێ هیچ هەراو هوریایەك هەڵدرا بۆ ئاسمان و پاش ١٤ رۆژ هەنگاوێکی گرنگی لەسەر دۆزینەوە ئاسمانییەکان هەڵگرت.*

*پێشتر لۆناکانی دیکە لە هەوڵەکانیان بۆ ئەنجامدانی ئەرکی تایبەتی سەرکەوتوو نەبوون و تەنیا لۆنای ١٤، توانی بەدەوری مانگدا بسوورێتەوە.*

**٦- شێوازی تەشریحی یان لۆژیکی:**

لەم شێوازەدا بەش بەشی رووداوەکە ئەنووسین و دواتر وردەکاری پێویست و باسی پەراوێزی لەسەر هەریەك لەبەشەکانی ئەخەینەروو، ئەم شێوازە بۆ ئەو رووداوانە بەکار دێت کە جیاوازی بیروڕای زۆری لەسەرە و نووسەر دەتوانێ دوای هەر بەشێك بیروڕای نارازی و رازییەکان لەگەڵیاندا بنووسێ. ئەوەش بڵێین کە ئەم شێوازە بۆ ئامادە کردنی ئەو هەواڵانەی کە درێژن یان بە تایبەت بۆ نووسینی ریپۆرتاژی «دووردودرێژ» بە کاردێت.

## مانشێت چیە؟

مانشێت هاندەری خوێنەرە بۆ خوێندنەوەی هەواڵ. خوێنەر بە روانینێکی کورت لە مانشێتەکان هەروەها ئەو بابەتانەی کە پەیوەندییان لەگەڵ ژیانیا هەیە، هەواڵ دەخوێنێتەوە. خوێنەر دەست ئەداتە هەڵبژاردنی بابەتەکان و ئەوانەی کە بە لای ئەوەوە گرنگی هەیە و پێویستییەکانی دیاری دەکەن، دەخوێنێتەوە. بۆیە لە رۆژنامەکاندا مانشێت دەورێکی گرنگیان هەیە بۆ راکێشانی سەرنجی خوێنەران. چونکو زۆربەی خەڵك بە خوێندنەوەی مانشێتی لاپەڕەی یەکەمی رۆژنامەکان دەیکەن، هەر بۆیە مانشێتی لاپەڕەی یەکەمی رۆژنامەکان بە فۆنتی گەورە دەنووسرێتەوە.

جیا لە هاندانی خوێنەر بەرەولای هەواڵ و باس کردنی کورت و پڕمانای هەواڵ، مانشێت بۆ خۆی چەند ئەرك و تایبەتمەندیی دیکەی هەیە.

**١- رازاندنەوەی لاپەڕەکانی رۆژنامە.**
**٢- جیا کردنەوەی بابەتەکانی رۆژنامە.**
**٣- نرخ و گرنگی بابەتە جۆربە جۆرەکان دیاری دەکات.**
**٤- هاندانی خوێنەر بۆ خوێندنەوەی «لید» و «دەقی» هەواڵ.**
**٥- خستنە رووی کورتەیەك لە هەواڵەکە.**

بە پێی رۆڵی مانشێت لە دیاریکردنی ئاستی گرنگی بابەتەکان، ئەبێ بە شێوەیەك بنووسرێت کە هەڵگری کورتەی گرنگترین بابەتی رووداوەکە بێت. بە واتایەکی دی مانشێت ئەبێ بە کەمترین وشەوە بتوانێ زۆرترین مانا بە دەستەوە بدات بێ ئەوەی ببێتە پەیامێکی تیلگرافی.

*د- کازمی موعتەمەید نەژاد لە کتێبی «رۆژنامەگەریدا» پێنج ئەرك بۆ مانشێت دیاری دەکات.*



***یەکەم:* مانشێت بابەتی چاپەمەنییەکان دیاری دەکات:** هەموو ئەو بابەتانەی کە لە رۆژنامە و گۆڤارەکاندا بڵاو دەبنەوە خاوەنی مانشێتی تایبەت بە خۆیانن و لە رێگەی مانشێتەوە ئەتوانین بابەتەکان لە یەکتر جیا کەینەوە. نەك تەنیا هەواڵەکان، بگرە دەبێ ئاگاداریی و بابەتەکانیتری رۆژنامە و هەفتەنامەکان هەر لە رێگەی مانشێتەوە لە یەك هەڵاوێردرێن. جاران بابەتی رۆژنامەکان بێ مانشێت بوون یا خود هەر هەموویان یەك جۆر مانشێتیان هەبوو کە جیاکردنەوەیان لە یەکدی زۆر ئاسان نەبوو، بەڵام لە رێگەی جێ بەجێ کردنی ئەو شێوازانەی کە ئەمڕۆ لە رۆژنامەکاندا بە کار دێن خوێنەران ئەتوانن بە ئاسانی بابەتە خواستراوەکانیان بدۆزنەوە.

***دووهەم:* کورتەی رووداوەکە دەرئەبڕێ:** مانشێت کورتەیەکی رووداوەکە، گرنگترین بەشی رووداوەکە دەخاتە روو. هەر ئەم کورتە باسەش جۆری بابەتەکان دیاری دەکات و لە وێڵبوون لە ناو گێژاوی بابەتە زۆرەکان رزگاری دەکات.

***سێهەم:* بۆ راکێشانی سەرنجی خوێنەران بەکار دێت:** نووسینەوەی کورتەی رووداوەکان نە تەنیا جۆری هەواڵ و بابەتەکان دیاری دەکات. بەڵکو ئەبێتە هۆی راکێشانی سەرنجی خوێنەرانیش بۆ لای بابەتەکە. یەکەمین پەیوەندی رۆژنامە یان گۆڤار لەگەڵ خوێنەر لە رێگەی مانشێتەوە دروست دەبێت. بۆیە دەبێ لە یەکەمین پەیوەندییدا وا لە خوێنەر بکەین، درێژە بە خوێندوەی بابەتەکان بدات.

***چوارەم:* ئاستی گرنگی بابەتەکان روون دەکاتەوە:** مانشێت لە دوو رێگەوە هەواڵ دیاری دەکات. یەکەم لە رێگای گێڕانەوەی کورتی چیرۆکی رووداوە کە، لێرەوە خوێنەر ئاگاداری ناوەرۆکی هەواڵەکە دەبێت. دووهەم خوێنەر لە رێگەی شوێن و گەورەیی و بچووکی پیتەکانیەوە گرنگی هەواڵەکەی بۆ ئاشکرا دەبێت.

***پێنجەم:* فۆرمی بڵاوکراوەکە جوان دەکات:** فۆرمی دەرەوەی بڵاوکراوەکان یەکێکە لە هۆکارەکانی راکێشانی سەرنجی خوێنەران. سەرنووسەر و خاوەن ئیمتیازی

چاپەمەنی‌یەکان هەموو تەقەلایەك لە پێناوی رازانەوەی بڵاوکراوەکانیان دەدەن.

مانشێت جگە لەو خەسڵەتانەی کە باسکران رۆڵێکی گرنگی هەیە لە جوانتر کردنی دیمەنی دەرەکی رۆژنامە و گۆڤارەکان.

**- بنەماکانی نووسینی مانشێت:**

دەتوانین بڵێین سەرەکی ترین تایبەتمەندی مانشێتێکی باش، رادەی راکێشانی سەرنجی خوێنەرە.

مانشێت دوای ئامادە کردنی هەواڵ ئەنووسرێت و پێویستە هەواڵنێر شارەزایی لە بنەماکانی مانشێت نووسیندا هەبێت، چونکو یەکەم پەیوەندی نێوان خوێنەر و رۆژنامە هەر لە رێگەی مانشێتەوە دائەمەزرێت. خوێنەر بە روانینێکی کورت و خێرا بە سەرلاپەڕەی یەکەمدا بڕیار ئەدا کە بابەتەکە بخوێنێتەوە یان نا. بۆیە لە کاری رۆژنامەگەریدا گرنگییەکی زۆر یا (باش) بەم بابەتە ئەدرێت و رۆژنامەنووسانی بە ئەزموون کە شارەزایی و لێهاتوویی‌یان هەیە لە بواری زمانەوانی و ئامادە کردنی هەواڵدا ئەم ئەرکە دەگرنە ئەستۆ.

بڕێ جاریش لە رۆژنامەکاندا بۆ ئەم ئەرکە کەس یان گرووپێکی پسپۆڕ کاری مانشێت نووسین ئەنجام ئەدەن. ئەمە ئەو بابەتە ئاشکرا دەکات کە لە بازاڕی رۆژنامەگەریدا گەر بێتو رۆژنامەیەك خوێنەر سەرنجی نەداتێ و نەیکڕێ. ئەوا مەرگی حەتمی دەبێت. هەر بۆیە پێویست دەکات لە نووسینی مانشێتدا رەچاوی هەندێ خاڵی گرنگ بکەین تاکو مانشێتێکی باش و سەرنجراکێش بنووسرێت:

*١- مانشێت ئەبێ لەگەڵ بابەتەکانی لیدی هەواڵدا، هاو دەنگ بێت.*

*٢- لە نووسینی مانشێتدا ئەبێ وشەی ئاشنا و رەوان بەکار بێنین.*

*٣- مانشێت ئەبێ روون و راست بێ و دوور بێ لە هەر چەشنە هەڵەیەکی مانایی.*

*٤- مانشێتی بێ «کار» زۆر جاران ئەبێتە دروشم و ناتوانێ پەیامەکە بە باشی*



*بگەیەنێت.*

*٥- هەڵبژاردنی «کار»ی دروست و شیاو، رەمزی سەرکەوتن، لە نووسینی مانشێتدایە.*

*٦- مانشێتی پرسیاری قەد بە کار مەهێنن.*

*٧- لە نووسینی مانشێتدا «کار»ی نیگاتیڤ بە کار مەهێنن.*

*٨- بە هیچ جۆرێك وشەیەك دوو جار بە «کار» مەهێنن.*

*٩- هەرچی مانشێتەکە کورت تر بێت باشترە.*

*١٠-پیتی زیادی لە سەرەتای مانشێتدا نەنووسن.*

*١١-لە هەڵبژاردنی وشەی مانشێتدا ئەبێ ئەندازە و فیگۆری وشەکان رەچاو بکەین، تاکو هاوسەنگایەتی نێوان رواڵەت و فیگۆری وشەکان بپارێزرێت.*

*١٢-مانشێتی قسەگێڕانەوە کاتێ دەتوانین راستەوخۆ بەکار بێنین کە ئەو تایبەتمەندی‌یانەی سەرەوەی لەخۆدا کۆکردبێتەوە.*

*١٣-دەنا ئەبێ بە شێوەی قسە گێڕانەوەی ناراستەوخۆ بنووسرێت.*

*١٤-تا ئەو جێگایەی دەکرێت مانشێت لە رووی لیدەوە بنووسن.*

**- بەشەکانی مانشێت:**

رۆژنامە و گۆڤارەکان جیا لە مانشێتی سەرەکی و بنەمایی، هەندێ مانشێتی دیکە بە پیتی بچووك لە بان و خواری مانشێتی سەرەکی دا دەنووسن کە لێرەدا باسی لێ دەکەین.

**١- مانشێتی سەرەکی Main Headline:**

بە مانشێتێ کە گرنگترین بابەتی هەواڵ باس بکات دەگوترێ: «مانشێتی سەرەکی»، کە بە فۆنتی گەورەتر ئەنووسرێت و هەندێ جار لە لاپەڕەی یەکەمی

چاپەمەنیەکانیشدا لە چاو مانشێتەکانی دیکە گەورەتر دەنوێنێ.

**مانۆڕی هاوبەشی هێزی پێشمەرگە و چەکدارانی ئەمریکی لە چیای قەرەداغ بەڕێوە چوو**

ئەبێ لە یادمان نەچێ کە لە کۆتایی مانشێتی سەرەکی دا نابێ خاڵ دابنێین، بەڵام لە نێو رستەی مانشێتەکەدا دەتوانین.

٢- **سەرمانشێت Kicker**:

سەرمانشێت یان (روتیتر) لە سەرووی مانشێتی سەرەکی بە پیتی بچووک دەنووسرێت. سەر مانشێت ئەبێ سەربەخۆ بێت و بە لابردنی مانشێتی سەرەکی بتوانێ مانای خۆی بگەیێنێ.

*وەزارەتی رۆشنبیری راپگەیاند:*

**فستیوڤاڵی هەژار موکریانی سبەینێ لەهەولێری پایتەخت دەکرێتەوە**

٣- **ژێر مانشێت Deck**:

ژێرمانشێت، پاش مانشێتی سەرەکی و بە پیتی بچووک دەنووسرێت. بابەتی ژێرمانشێت دەتوانێ تەواوکەری مانشێتی سەرەکی و سەر مانشێت بێت یان بابەتێکی سەربەخۆی هەبێت. لە هەر حاڵدا، مانشێتی سەرەکی ئەبێ، بێ بوونی سەرمانشێت و ژێرمانشێت مانایەکی سەربەخۆ و کامڵ بگەیێنێت.

*دایەرەی رێگاوبان:*

**بەفر و بۆران زۆربەی ناوچەکانی رۆژهەڵاتی کوردستانی داپۆشیوە**

**هاتوو چوو لە رێگاکاندا بە دژواری ئەنجام دەدرێت**



٤- **کورتە مانشێت Short head**:

هەندێ جار کە بابەتەکانی نێو هەواڵ رەنگاورەنگ و درێژن، دەتوانین کورتەیەك لە بابەتە گرنگەکان پاش مانشێتی سەرەکی یان ژێرمانشێت، بە شێوەی رەستەگەلێکی سەربەخۆ بنووسین.

لەپیشەی رۆژنامەنووسیدا بە کورتە مانشێت ئەڵێن «سوتیتر». کورتە مانشێت لە نێو هەواڵدا بە دانانی ئەستێرەی بچوك یان خاڵی گەورە لە سەرەتایدا دیاری دەکرێت.

کورتە مانشێت یان سوتیتر لە راپۆرت و وتووێژ یان وتارەکاندا بۆ ئەم مەبەستە بە کار دێت کە سەرەڕای رازاندنەوەی لاپەڕی بابەتەکە، پێشگیری بکات لە ماندوو بوونی خوێنەر.

***سەرمانشێت*** – **رێکەوتن نامەی کوریای باکوور و کوردستان**

**گەورەترین کارخانەی پێڵاوی رۆژهەڵاتی ناوین لە کوردستان ساز دەکرێت**

ژێرمانشێت- **کارخانەی پێڵاوی زریبار هەموو ساڵێ ٥٠٠ هەزار پێڵاو بەرهەم دێنێ.**

کورتە مانشێت- *** ئەم کارخانەیە لە ٢ کیلومەتری شاری دهۆك هەڵکەوتووە و بە پشتیوانی ١٥٠ ملیۆن دۆلار، توانای کار پەیدا کردنی بۆ ٤٠٠ کەس هەیە.**

کورتە مانشێت- **وەزیری بازرگانی کوردستان لە سەفەری بۆ کوریای باکور، چەندین رێکەوتننامەی ئابووری و بازرگانی لەگەڵ ئەو وڵاتەدا واژۆ کرد.**

### ٥- نێوانەمانشێت Subhead :

نێوانەمانشێت لە چەند وشە یان چەند ڕەستەی کورت پێکهاتووە وبۆ جیا کردنەوەی بابەتەکانی هەواڵگەلی چەند هەواڵی بەکار دێت. بە کار هێنانی نێوانەمانشێت لەم جورە هەواڵانەدا نە تەنیا پێویستە بەڵکو خوێنەر بۆخوێندنەوەی بابەتەکانی هەواڵ یارمەتی ئەدات.

قەبارەی پیتی نێوانەمانشێت لە چاو پیتی دەقی هەواڵ گەورەترە. بۆ ئەوەیە خوێنەر بە خێرایی چاوی لێ بکات.

### ٦- مانشێتی کوێر Blind head:

لەم مانشێتەدا کە بۆ هاندانی خوێنەر و دروست کردنی پرسیار لە زەینیدا ئەنووسرێت، هیچ چەشنە ئاماژەیەك بە خودی هەواڵ ناکرێت. ئەم جۆرە مانشێتانە بۆ هەواڵیَ حادسە ئامێز و پڕڕووداو زیاتر بەکار دێن.

**هاوار لە نهۆمی چوارەمدا**

**پێڵاوەکان هەموو شتێکیان درکاند**

* * *

**ئاسمانیَ ئاور و مەرگی بێدەنگ**

**کوردستان لە ژێر پۆستاڵی دوژمندا**

### دەکریَ (تێگەیشتنەمانشێت) Intuitive Head :

ڕۆژنامەنووس بە پێی تێگەیشتنی لە هەواڵ و ڕاپۆرت و ڕووداوەکان، مانشێتیتێگەیشتنی ئەنووسێت. لەم جۆرە مانشێتەدا مەبەست خستنەرووی ناراستەوخۆی بابەت و چەمك و تێگەیشتن و کورتەیەك لە کۆی هەواڵ و



ڕووداوەکانە. خاڵێکی گرنگ لە نووسینی ئەم جۆرە مانشێتەدا ئەوەیە کە، شێوە ڕوانینی ڕۆژنامەنووس و شێوازی ڕۆژنامە و لێهاتوویی لە بواری مانشێت نووسیندا کاریگەریان هەیە لە نووسینی ئەم جۆرە مانشێتەدا.

**** وتەکانی ڕێزدار نێچیرڤان بارزانی سەبارەت بە ئەرك و ڕۆڵی ژنان لە کۆمەڵگادا***

**خوێنەر بە دیتنی ئەم مانشێتە تیَ دەگات کە وتەکانی نێچیرڤان بارزانی سەبارەت بە «ژنان»ە لەم مانشێتەدا ڕۆژنامەنووس یان گرنگ ترین بابەتی وتەکان کە سەبارەت بە ڕۆڵ و ئەرکی ژنان بووە لە مانشێتەکەدا هێناویە یان تەنیا ئاماژەی کردووە بە بابەتی وتەکان.**

***١- وتەکانی بەرپرسی هێزی پێشمەرگە سەبارەت بە ئاسایش و هێمنایەتی ناوچەی هەڵەبجە.***

***٢- نویَ ترین هەواڵەکان سەبارەت بە سەرکەوتنەکانی هێزی پێشمەرگە.***

***٣- شەڕ و پێکدادانی هێزی هاوپەیمانان لەگەڵ سوپای بەعس.***

ئەم مانشێتانە هەر چەندە «کار»ی نیە، بەڵام وەکو مانشێتێکی گشتی و نادیار نایێنە ئەژمار، چونکو ماناکەیان تەواوە و «کار» بۆ ڕازانەوەی ڕستەکە لابراوە. ئەمە یەکیَ لەو حاڵەتانەیە کە دەتوانین مانشێتەکەمان بیَ «کار» بنووسین. مانشێتی تێگەیشتنی هیچ کاتیَ بە شێوەی قسەگێڕانەوەی ڕاستەوخۆ نانووسرێتەوە.

### ٨- مانشێتی Persuasire یان «اقناعی» یان پڕۆپاگەندەیی:

ئەم مانشێتە هەڵگری ئامانجێکی دیاری کراوە، لە ڕاستیدا ئەم مانشێتە بۆ کاریگەری لەسەر بیروڕای گشتی و تەبلیغ و بەرجەستە کردنەوەی بابەتیَ لە نێو کۆمەڵگادا ئەنووسرێت. بە شێوەی گشتی پڕۆپاگاندەی ناڕاستەوخۆ پەیامێکی هەواڵی بە مەبەستی هاندان و ڕاکێشانی سەرنجی چین و گرووپ و دەستەکانی کۆمەڵگا ئەنووسرێت.

لەم جۆرە مانشێتانەدا، وشەکان ڕۆڵی دابینکەرانەیان هەیە و ئەبێ بە وردبینییەوە وشەی ڕستەی مانشێتەکە هەڵبژێرین. لە تایبەتمەندییەکانی مانشێتی پڕۆپاگاندەیی بە کار هێنانی ئاوەڵناوە. لە بیرنەکەین بە کار هێنانی ئاوەڵناوی هەڵسەنگاندنی بە تەنیایی نابێتە هۆی تەبلیغی بوونی مانشێت. بۆ وێنە: بەکار هێنانی ئاوەڵ ناوی «گەورەترین» سەبارەت بە دامەزراندنی پردێ لە وڵات حاڵەتی تەبلیغی بە مانشێت نادات.

لەمانشێتی پڕۆپاگاندەیی یان «اقناعی» بە جۆرێ ڕەنگ و بۆنی سیاسی و تەبلیغی بەسەر ڕستەی مانشێتەکەدا زاڵە.

**١- عێراق پێشنیاری ئەمریکای بۆ وت و وێژ سەبارەت بە کوێت قەبووڵ کرد**

**٢- ئامادەیی عێراق بۆ وتووێژ لەگەڵ ئەمریکادا ڕاگەیاندرا**

**٣- ڕێکەوتنی عێراق و ئەمریکا بە مەبەستی وت وێژ لە ژنێڤدا**

ئەم سێ مانشێتە لە ڕواڵەتدا یەك مانا و چەمك دەگەیەنن. بەڵام کاریگەریەتی مانشێتی سێهەم بە هۆی بەکار هێنانی وشەی «ڕێکەوتن» ناڕاستەوخۆ هاودەنگی و هاوڕێیی دوو وڵات زیاتر دەگەیێنێ.

دەربارەی مانشێت و لید لە کتێبەکانی ڕۆژنامەنووسیدا پێشنیار دەکرێت، کە مانشێت لە ڕووی لیدی هەواڵەکەوە بنووسن، بەم کارە خوێنەر خێراتر ئاگاداری چۆنیەتی هەواڵ دەبێت. گەر لە پەرەگرافی یەکەمدا (لید) شیکاری زیاتر سەبارەت بە هەواڵەکە باس نەکرابێت، ڕەنگە خوێنەر هەواڵ نەخوێنێتەوە. ئەمە دروستە و ئەبێ لەبەرچاوی بگرین، بەڵام هەندێ جار و بە تایبەت لە کاتی نووسینی مانشێتی تیگەیشتن یان دوو مانشێتییەکان، ڕەنگە خوێنەر بە نەختێ تێڕامان بۆ خۆی لە ناوەڕۆکی ڕووداوەکە بگات.



### - *ڕووداوی دوومانشێتی لە ڕۆژنامەکاندا:*

ڕۆژنامەگەری بابەتێکی زانستی و هەواڵیە، هەر بۆیە داهێنان و زەوق وەك دووبنەمای سەرەکی لەم پیشەیەدا کردن. نووسینی دوو مانشێت بۆ ڕووداوێکی هەواڵی لە هەمان کاتدا پێویستی بە زانیاری و وردبینی هەیە، بەڵکو بۆ خۆی هونەرە و مانشێت نووسی لێهاتوو هەر دوو لایەنی زەوق و هونەر لەگەڵ زانستی ڕۆژنامەگەریدا تێکەڵاو دەکات.

هەندێ لە ڕۆژنامەکان بۆ ڕازانەوەی لاپەڕەی ئەوەڵی ڕۆژنامەکەیان سەبارەت بە ڕووداو یان ئەو ڕووداوانەی کە لەگەڵ یەکدا پەیوەندییان هەیە، دوومانشێت ئەنووسن.

لە ڕۆژنامە کوردییەکاندا بە شێوە زانستی و هونەرییەکەی، دوو مانشێت بە کار نەهاتووە لێرەدا بە تێرو تەسەلی باسی لێدەکەین.

*** دوومانشێتی چیە؟**

دوو مانشێت بۆ هەواڵگەلی چەند بابەتی یان یەك بابەتی و ئەو هەواڵانەی کە لە چەند ڕووداو پێکهاتووە بە کار دێت. هەواڵی دوو مانشێتی جیاوازە و لە هەمان کاتیشدا پەیوەندییان پێکەوە هەیە، واتا پەیوەندییەکی مانایی بەرقەرارە.

هەر دوو مانشێتەکە لە ڕووی لیدەوە دەنووسرێن یان مانشێتێ لە ڕووی لید و ئەوی دیکەش لە ڕووی دەقی هەواڵەکەوە.

بە هۆی ئەوەی کە دوو مانشێتییەکان بۆ هەواڵی چەند بابەتی زیاتر بە کار دێت، دەتوانین مانشێتەکان بە پێی خوێندنەوەی بەشەکانی هەواڵ بنووسین. لە باری فۆرمەوە مانشێتی ئەوەڵ بێ «کار» دەنووسین و مانشێتی دووهەم ئەبێ «کار»ی ببێ. هەر چەندە هەندێ جار بۆ ڕازاندنەوەی زیاتری مانشێتەکان دەتوانین بۆ هەر دوو مانشێت «کار» بنووسین بەڵام «کار»ی کۆتایی مانشێتی دووهەم لە باری ماناییەوە، مانشێت پڕ ماناتر دەکات.

*١ - نووسینی مانشێت بۆ هەواڵی چەند بابەتی.*

**سەرۆك كۆمار نێوان ئاشوریەكان**

**سازكردنی بەربەندی دووكان دەستی پێكرد**

*٢ - نووسینی مانشێت بۆ هەواڵی یەك بابەتی.*

**هێرشی دڕندانە بۆ سەر ئاوایی خێڵی حەمە**

**٧٠ پێشمەرگە شەهید كران**

*٣ - نووسینی مانشێت بۆ هەواڵی چەند بابەتی لە سەر شێوازی تێگەیشتن.*

**تەقینەوەی خوێناوی لە ناوچە**

**ئاژیری مەترسی لە هەولێر و سلێمانی زڕایەوە**

*٤ - نووسینی مانشێت بۆ هەواڵی چەند رووداوی.*

**هێرش بۆ سەر بنكەو مۆڵگەی تیرۆریستان**

**جوندەل شەیتان خاكی كوردستانیان بە جێ هێشت**

*٥ - نووسینی مانشێت بۆ هەواڵی چەند رووداوی لەسەر شێوازی تێگەیشتن*

**لق و پۆی خوێناوی زەیتون لە مادرید**

**چەكداران و پارلەمەنتارانی ئەمریكی و ئیسرائیلی كەوتنە بەر هێرش**

**- مانشێتی پرسیاری:**

تا ئەو جێگایە كە بۆمان دەكرێ نابێ مانشێتی پرسیاری بە كار بێنین، چونكو



پرسیار كردن لە خوێنەر كاردانەوەی خراپی هەیە، ئەبێ رۆژنامەنووس وڵامی پرسیاری خوێنەر بداتەوە. هەر بەم بۆنەوەیە كە مانشێتە هەواڵییەكان بە شێوەی پرسیاری نانووسرێن. مەگەر ئەوەی كە وڵامی پرسیار لە هەمان كاتدا لە خودی پرسیارەكەدا هەبێ. شێوە روانینی رۆژنامەنووس و زاڵ بوونی بەسەر سەرجەم لایەنەكانی هەواڵدا یارمەتی ئەدات كە بتوانێ مانشێتی پرسیاری بە گۆشەنیگاییەك بە داهاتوو بنووسێ. توانایی پێش بینی رۆژنامەنووس رۆڵی گرنگی هەیە لە

نووسینی مانشێتی پرسیاریدا. خوێنەر ئەبێ بە خوێندنەوەی مانشێتی پرسیاری، وڵامی پرسیار لە مانشێتەكەدا بدۆزێتەوە.

سەرنج بدەنە ئەم مانشێتە كە لە میانی زنجیرە رووداوەكانی پەیوەند بە قەیرانی ناو خۆی ئەلجەزایرنووسراوە و رۆژنامەنووس بە پێشبینی كردنی ئەوەیكە چەكداران لە ئەل جەزاییر دەسەڵات ئەگرنە دەس، ئەم مانشێتەی نووسیوە.

**ئەلجەزایر، ئامادەیی موسڵمانان بۆ دامەزراندنی حكوومەت سوپا كودەتا دەكات؟**

**- مانشێتی قسە گێڕانەوە:**

لەم جۆرە مانشێتانەدا سەرچاوەی هەواڵەكەش ئەنووسرێت تاكو مانشێت جێ متمانەتر بێت واتا سەنەدییەتی ببێ ئەتوانین لە سەرەتای قسەكەدا ئەم سەرچاوە بنووسین یان وەكو سەرمانشێت بیهێنینەوە.

**لۆمۆند: < سیاسەتی فەرەنسا لە ئەلجەزایر تووشی شكست هات >**

سەرچاوەی هەواڵ كە رۆژنامەی «لۆمۆند»ە لە سەرەتای مانشێتەكەدا نووسراوە.

**لۆمۆند رایگەیاند کە :**

**سیاسەتی فەرەنسا لە ئەلجەزایر تووشی شکست هات**

لێرەدا سەرچاوەکە، خۆی بۆتە سەرمانشێت.

**- نیو مانشێت:**

هەندێ جار لە بابەتی رۆژنامەکاندا جگە لە بابەتی سەرەکی هەواڵ، کە مانشێتی سەرەکی لیکەوتۆتەوە، مەسەلەیەکی گرنگ هەیە پێویست دەکات مانشێتێکی بۆ دابنرێت. لەم حاڵەتەدا لە نیو مانشێت کەڵك وەردەگرن کە پاش مانشێتی سەرەکی لە هەموو مانشێتەکان گرنگتر و بەرجەستەترە.

جێگەی نیو مانشێت لە مانشێتێکی تەواودا لە ژێر مانشێتی سەرەکی دا جێ دەگرت و لە پێش کورتە مانشێتەکانەوەیە. پیتەکانی نیو مانشێت پاش مانشێتی سەرەکی دەبێ لە پیتی هەموو بەشەکانی‌تر گەورەتربن.



## هەڵبژاردنی شێوەو و رواڵەتی مانشێتەکان

١- **مانشێتی یەك دێڕی** **Single – Lineheadline:**

ئەم مانشێتە لە هێڵێکی راست کە یەك یان چەند ستوون دەگرێتەوە پێك هاتووە.

**کوردستان و پەڕینەوە بەرەو سەربەخۆیی**

٢- **مانشێتی دوو دێڕی یەکسان** **Multi- Linehealine:**

ئەم مانشێتە بە پێی رادەی ستوونەکان، بە شێوەی هەشت گۆش و چوار گۆش ئەنووسرێت.

**نووسەری کوردستانی رۆژهەڵات**
**خەڵاتی< کریستێین ئاندێرسێن >ی وەرگرت**

٣- **مانشێتی چەند دێڕی یەکسان:**

ئەم جۆرە مانشێتانە بۆ مانشێتی بچووك کە بە پیتی بچووك ئەنووسرێت بە کار دێت و رادەی ستوونەکانیش لەیەك تا چوار ستوونە.

**رێکەوتن نامەی هاریکاری زانستی**
**فێرکاری و تەکنۆلۆژیای ئەڵمانیا و**
**کوردستان ئەمرۆ واژۆکرا**

٤- **مانشێتی پەیژەیی** **Stepped headline**

ئەم مانشێتە بۆ ئەو هەواڵانەی کە ٢ تا ٣ ستوونیان هەیە بە کار دێت و بە شێوەی پەیژە ستوونەکان بە دوای‌یەکدا دێن.

**سەرۆك بارزانی ئەمرۆ**

**له کۆڕی هەواڵنێران و ڕۆژنامەنووسان دا**
**باسی له سیستەمی ئابووری نوێی کوردستان کرد**

٥- **مانشێتی هەرەمی سەروژێرکراو** Inverteil pyramid headline:

ئەم مانشێتە بۆ هەواڵی ٢ تا ٣ ستوونی بەکەڵکە و لە دوو تا سـی دێـڕ پێـك هاتووه و قەبارەی دێڕەکان لە سەرەوە بۆ خوارەوە کەم دەبێتەوە.

**یەکەمین پیشانگای نێونەتەوەیی کوردستان**
**بە بەشداری ٥١ وڵات کرایەوە**

٦- **مانشێتی سێ گۆش:**

ئەم مانشێتە بە پێچەوانەی هەرەمی سەروژێر کراو، لە دێڕی کورتەوە دەس
پێدەکات و لە کۆتاییشدا دێڕەکان درێژتر دەبنەوە و
ڕواڵەتی سێ گۆشیان هەیە.

**کۆنفرانسی نێونەتەوەیی ئەنفال لە شـاری سلێمـانی ئەمـڕۆ بە بەشـداری چینـە جـۆر بـە جـۆرەکانـی خـەڵکـی و ڕۆشنبـیران دەسـتی پێکـرد**

*** چەند فیگۆری دیکەی مانشێت:**

- مانشێتی نیو هەرەمی بەرەو چەپ

❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊
❊❊❊❊❊❊❊
❊❊❊❊

- مانشێتی نیو هەرەمی بەرەو ڕاست

❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊



❊❊❊❊❊❊❊
❊❊❊❊

- مانشێتی سێ گۆش بەرە و چەپ

❊❊❊❊
❊❊❊❊❊❊❊
❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊

- مانشێتی سێ گۆش بەرەو ڕاست

❊❊❊❊
❊❊❊❊❊❊❊
❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊

- مانشێتی نایەکسانی بەرەو چەپ

❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊
❊❊❊❊❊❊❊
❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊

- مانشێتی نایەکسانی بەرەو ڕاست

❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊
❊❊❊❊❊❊❊
❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊

- مانشێتی نایەکسانی چەق بەستوو

❊❊❊❊❊❊❊❊
❊❊❊❊❊❊
❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊❊

**- بە شێوەیەکی گشتی مانشێت دەکەوێتە ژێر ئەم کاریگەریانەی خوارەوە:**

**١- کورت و درێژی دەقەکە:**

دەق و مانشێت دەبێ لە رووی ئەندازەوە لەگەڵ یەکدا گونجاو بن. بۆ دەقێکی درێژ، مانشێتی درێژ و بۆ دەقی کورت مانشێتی کورت بە کار دێت. بەڵام لە هەندێ حاڵەتدا ئەم بنەمایە جێبەجێ نابێ. بۆ نموونە بۆ ئەو هەواڵە گرنگانەی کە درەنگ وەخت و لەو کاتەدا دەگەن کە رۆژنامەکە لە ژێر چاپدایە مانشێتێکی درێژ هەڵدەبژێردرێ. وەك هەواڵی کوودەتا یان شۆڕش و یان رووداوی گەورە.

**٢- شوێنی چاپکردنی بابەتەکە:**

تا رادەیەك گرنگی بابەتەکان بەندن بەو شوێن و ستوونانەی کە لە رۆژنامە و گۆڤارەکاندا بۆیان دیاری کراوە. کەواتە گرنگی مانشێتەکانیش بە پێی دەق و شوێنی دانانی دەقەکە لە رۆژنامەکەدا دەگۆڕدرێ. شێوە و رواڵەتی مانشێتەکانی لاپەڕەی یەکەم لە مانشێتەکانی ناوەوە جیاوازن، تەنانەت ئەو مانشێتانەی کە لە سەرووی لاپەڕەکەوە دادەنرێن جیاوازن لەوانەی کە لە ناوەڕاست یان خوارەوەی لاپەڕەکاندا دادەنرێن. بە شێوەیەکی گشتی گرنگی مانشێتەکانی لاپەڕەی یەکەم و دوا لاپەڕە لەوانەی ناوەوە زۆرترە. لە تەنیشتیەکدانانی بابەتەکانیش کار دەکاتە سەر شێوەی مانشێتەکە. هەندێ جار مانشێتی بابەتێك لە بەر نزیکی لەگەڵ بابەتێکی تردا «چ لە رووی شێوە، چ لە رووی ئەندازەوە» وەکو یەك دادەنرێت، بەڵام جاری واش هەیە بە پێچەوانەوە زۆر لە یەکتری جیاواز دەبن.

هەمیشە دەبێ مانشێت لە سەرووی بابەتەکانەوە بنووسین، بەڵام هەندێ جار لەبەر نەبوونی جێگە لە لاپەڕەی یەکەم دا و دوا لاپەڕە تەنیا مانشێتەکان دادەنرێن و ناوەڕۆکەکانیان دەبرێنەوە لاپەڕەکانی ناوەوە. بۆ ئەوەی یەکەم لاپەڕە و دوا لاپەڕە نەبنە جێی مانشێت بۆیە دەکرێ هەندێ لە بابەتەکان لە ژێر مانشێتەکاندا بنووسرێنەوە و تەنیا زیادەکان ببرێتە لاپەڕەکانی ناوەوە. لە هەر حاڵەتێکدا گرنگی گەورە و بچووکی مانشێتەکان بەو شوێنەوەگرێ دروان کە بۆیان تەرخان کراوە.



**٣- ژمارەی ستوونەکان:**

ئەندازەی پانی هەر ستوونێك لە رۆژنامەکاندا وتێنەپەڕاندنیان، لە گرنگ ترین هۆکارەکانی دانانی مانشێتن. لە کاری رۆژنامەگەریدا قسەیەك هەیە کە ئەڵێ: «قاڵبی فلزی لاپەڕەی رۆژنامەکان لە پێست و لاستیك دروست نەکراون تاکو چۆنت بۆی و بە ئارەزووی خۆت بیانبەستی یان رایانکێشی».

بۆ ستوونێکی ئاسایی رۆژنامە گەورەکان دەبێ مانشێتێك دیاری بکرێ کە لە نۆ (٩) «سیسرۆ» تێ نەپەڕێ، ئەگەر مانشێتەکە نیو سیسیرۆش لە ستوونەکە زیاتر بوو ئەوا جێگەی نابێتەوە و بە کار نایەت، بۆیە لەم حاڵەتەدا دەبێ ئەندازەی پیتەکانی مانشێتەکە بچووك بکەینەوە تاکو لەگەڵ ستوونەکەدا بگونجێ. بۆیە دەبێ لە داڕشتن و هەڵبژاردنی مانشێتدا ئەو شوێنەی بە بابەتەکە گرێدراوە لەبەرچاو بگرین و تا پێمان دەکرێ کارێك نەکەین مانشێتەکە جارێکی تر دەستکاری بکەینەوە.

**٤- ژمارەی دێڕەکان**

ژمارەی ئەو دێڕانەی کە بۆ مانشێتەکە دیاری کراوە کار دەکاتە سەر شێوەکەی. وەك وتمان لە هەواڵە کورتەکاندا نابێ مانشێت زیاتر لە دێڕێك تێپەر بێت. بەڵام بە پێچەوانەوە لە هەواڵە درێژەکاندا دەکرێ مانشێتەکە چەند دێڕ بێت. ئاشکرایە ژمارەی دێڕەکانی مانشێتی رۆژنامەکان بە پێی زەوق و سەلیقەی رۆژنامە و گۆڤارەکان دەگۆڕدرێ. بەڵام ئەبێ بزانین مانشێتی بابەتێکی مامناوەندی لە دوو یان سێ دێڕتیپەڕ نەکات.

لێرەدا کە باس لە ژمارەی دێڕەکانی مانشێت دەکەین، مەبەستمان بەشەکانی تری مانشێت نیە. چونکو ئەوانیش مانشێتی سەربەخۆن، بەڵکو مەبەستمان مانشێتی سەرەکی‌یە کە بەفراوانی بە کار دێت. ئەم جۆرە مانشێتانە لە بەر زۆری وشەکانیان و کەمی جێگا لە دوو یان سێ دێڕدا دادەڕێژرێن.

**- رۆڵی مانشێت لە چاپەمەنییەکاندا:**

لە نێوان رۆژنامەنووسان و پسپۆڕانی رۆژنامەگەریدا سەبارەت بەوەی کە فۆرم گرنگ ترە لە ناوەرۆك، بیر و بۆ چوونی جیاجیا هەیە. بێگومان رەنگاورەنگی و سەرنج راکێش بوونی فۆرم کار

دەکاتە سەر ناوەڕۆکیش. گرنگ ئەوەیە کە بتوانین لە رێگەی فۆرمەوە، خوێنەری زۆرتر بەدەست بێنین. رۆڵی مانشێت، راکێشانی سەرنجی خوێنەرە بەرەولای خوێندنەوەی هەواڵ و ئەم راکێشانە ئەبێ هەڵگری هەندێ تایبەتمەندی وەکو سەرنج راکێشان، تازەیی و تەبلیغ بێت. لێهاتووی لە بواری ئاشنایەتی لەگەڵ وشەکان و شێوازەکانی نووسیندا کلیلی سەرکەوتنە لە مانیشێت نووسیندا.

لەو شوێنەی دا کە مانشێت بەسەر مانادا زاڵ دەبێت وشە و دەستە واژەکان، رۆڵێکی گرنگیان هەیە. رۆژنامەنووس ئەبێ شارەزای ئەو زمانە بێت کە پێی دەنووسێ و وشە نوێیەکان بناسێ و بزانێ لە کوێدا بەکاریان بێنێ.

## لید چییە؟

پەرەگرافی ئەوەڵی هەواڵ کە لەسەر شێوازی هێرەمی سەروژێرکراو ئامادە دەکرێت پێی دەڵێن «لید». «Lead» لید، لە زمانی لاتیندا بە مانای ڕێنیشاندەرو ڕێنوێنی هاتووە. لە ڕاستیدا پەرەگرافی یەکەمی یان لیدی هەواڵ دەتوانێ خوێنەر بەرەولای خوێندنەوەی دەقی هەواڵ ڕێنوێنی بکات. لیدی هەواڵ داگری دوو ڕستەیە واتا ٣٠ تا ٤٠ وشە دەگرێتەوە.

لە لیددا کورتەی گرنگترین بابەت یان کورتەی گرنگترین بەشی هەواڵ باس ئەکرێت تاکو خوێنەر سەرنجی بداتێ.

نووسینی لیدی هەواڵ کارێکی زۆر گرنگە. هەواڵنێر ئەبێ بە خێرایی باسی گرنگترین بەشی ڕووداو بۆ خوێنەر بکات.

چیرۆك نووسەکان، زۆرجار لە چەند لاپەڕەدا باسی ڕووداو ئەکەن و سەرئەنجام لە کۆتایی چیرۆکەکەدا باس لە بابەتی سەرەکی ئەکەن، بەڵام لە بواری هەواڵ نووسیندا ئێمە ناتوانین ئەو کارەی چیرۆك نووس ئەنجام بدەین چونکە ئەبێتە هۆی ماندوو بوونی خوێنەر و ئیدی هەواڵەکە ناخوێنێتەوە.

لیدی نامۆ، سەر لە خوێنەر دەشێوێنێ. ئەگەر لید هەڵگری گرنگترین بابەتی هەواڵ بێت بێگومان کار دەکاتە سەر خوێنەر. بەکارهێنانی وشەی ڕوون و سانا کارێکی ئاسان نیە و پێویستی بە ئەزموون و زاڵ بوون بەسەر لایەنەکانی زماندا هەیە، هەر بەم بۆنەوە لە ڕۆژنامەکاندا «لید نووس» دیاری دەکەن.



**- پەیوەندی لید و ڕەگەزکانی هەواڵ:**

لە ڕابردوو باو بوو کە لیدی هەواڵ ئەبێ بە تەواو پرسیارەکانی پەیوەند بە ڕەگەزەکانی هەواڵ وڵام بداتەوە، بەڵام ئەمرۆکە ئەم شێوەیە بە دەگمەن بە کار ئەهێنرێت، چونکو لیدێ کە شەش ڕەگەزی هەواڵ وڵام بداتەوە، هەم درێژە و هەم ئەگەری ئەوە هەیە کە وەڵامدانەوەی ڕەگەزی هەواڵ لە سەرەتای هەواڵ دا پێویست نەکات. لە کاتی نووسینی لید ئەبێ ئەم وڵامانەی خوارەوە لە بەر چاو بگرین.

- **کام لایەنی ڕووداوەکە لەوانی دیکە گرینگترە**
- **بابەخەکانی هەواڵ کامانەن؟**
- **چ گۆڕانکاری گەلێکی نوێی بۆ ڕووداوەکە پێش هاتووە؟**
- **چلۆن دەتوانین بە کەمترین وشەوە، لیدێکی باش بنووسین؟**
-

**- لیدی بێ ناوەڕۆك و لیدی پڕ ناوەڕۆك**

لیدی بێ ناوەڕۆك: بە گشتی هەر ڕووداوێکی هەواڵی هەڵگری هەندێ بابەتی گرنگ و سەرنج ڕاکێشە، کە دەتوانین کورتەی گرینگترین بەشی ئەم ڕووداوە لە لیدەکەدا بنووسین. ڕۆژنامەوان ئەبێ لە نووسینی بابەتی گشتی و بێ ناوەڕۆکەوە (کلێشەیی) وزەق دوورەپەرێزی بکات.

- **لیدی گشتی و بێ ناوەڕۆك:**

**«دوێنێ لە دانیشتنی وەفدی دەوڵەتدا، سەبارەت بە کۆنترۆڵ کردنی نرخەکان قسە و باس کرا و هەندێ بڕیاریش درا»**

ئەو شتەی کە پێویستە لە لیدی ئەم هەواڵەدا بنووسرێت، ئەو بڕیار و بەڵێنانەی کە سەبارەت بە کۆنترۆڵ کردنی نرخەکان دراوە کە لەوێدا بە شێوەیەکی نادیار و نائاشکرا و گشتی باسی لێکراوە.

- **لیدی شیاو:**

وەفدی دەوڵەت دوێنێ بۆ بەرگری کردن لە زیاد کردنی نرخی کەل و پەلەکان بڕیارنامەی کۆنترۆڵ کردنی نرخەکان و بەربەرەکانێ دژی گران فرۆشی پەسەند کرد

- ***لیدی پڕناوەڕۆک:***

بەو رادەیەی کە بەکارهێنانی لیدی بێ ناوەڕوك نالەبارە و نابێ بە کاری بێنین، لیدێ کە هەڵگری شەش رەگەزی هەواڵ بێت، نالەبارە و پێکهاتەی نۆرماڵی هەواڵەکە تێك ئەدات.

▪ *سەرنج بدەنە ئەم نموونەیە:*

***عەباسی حسەین زادە، حەڤدە ساڵان، قوتابی قوتابخانەی سینا، کاتژمێری ٣ی دوانیوەڕۆی دوێنێ لە کاتی پیاسەکردن لە شەقامی سەعید، پاسێ بە ژمارەی ١٤٢٧٢ – سنە ١٢ . کە شۆفیرەکەی سەلیمی ناو بوو، لێیدا و بە هۆی قووڵ بوونی برینەکانیەوە، لە نەخۆشخانە کۆچی دوایی کرد.***

ئەم لیدە دەتوانین بەم شێوەیە بنووسینەوە:

***قوتابییەکی حەڤدە ساڵان، دوێنێ بە هۆی پێکدادانی پاسێکەوە گیانی خۆی لەدەس دا.***

بە هەرحاڵ ئەبێ ئەم خاڵە لە بەر چاو بگرین کە هەندێجار لە لیدی هەواڵ دا دەتوانین تەواو رەگەزەکانی هەواڵ، وڵامی بدەینەوە و ئەم کارەش لید پڕ ناوەڕوك ناکات. وەکو هەواڵەکانی پەیوەند بە پارلەمان و هەندێ راپۆرتە هەواڵ و وتووێژ.

– سەرنج بدەنە ئەم نموونەیە:

**نوێنەران بوودجەی ٢٠ میلیار دۆلاری ساڵی ٢٠٠٤ی کوردستانیان، لە دوایین ساتەکانی سەرساڵدا، لە دانیشتنی ئاشکرای پارلەمان بە زۆرترین دەنگەوە پەسەند کرد و پاشانیش بۆ بەڕێوەبردن پێشکەشی دەوڵەتیان کرد.**



**کێ؟** نوێنەران
**کەی؟** لە دوایین ساتەکاندا
**لەکوێ؟** لە دانیشتنی ئاشکرای پارلەمان
**چی؟** پەسەند کردنی بووجەی ٢٠ میلیار دۆلاری ساڵی ٢٠٠٤
**بۆچی؟** بۆ بەڕێوە بردن پێشکەشی دەوڵەت کرا
**چلۆن؟** بە زۆرترین دەنگەوە.

### * بەکار هێنانی رەگەز و بایەخەکانی هەواڵ لە نووسینی لید:

بۆ نووسینی لید دەتوانین لە رەگەزەکانی هەواڵ و بایەخەکانی هەواڵ کەڵك وەربگرین. ئەبێ هەواڵ بدەین تا ئەو جێگایەی کە بۆمان دەکرێ، وڵامی پرسیارەکانی پەیوەند بە رەگەزەکانی هەواڵ بە دەست بێنین و گرینگترینیان بۆ نووسینی لید بە کار بێنین و هەروەها بۆ ناسینی ناوەڕۆکی رووداوەکە لە بایەخەکانی هەواڵ یارمەتی وەربگرین.

بایەخەکانی هەواڵ بە شێوەیەکی روون و دیار رەگەزەکانی هەواڵ ئەخەنە روو. رەگەزی «کێ» و بایەخی «بە ناوبانگی» لە یەك هێڵدا یەکدەگرنەوە. رەگەزی «کەی» باس لە لایەنی تازەی هەواڵ دەکات. «لە کوێ» لایەنی نزیکایەتیە. رەگەزی «چی» باس لە ناوەڕۆکی هەواڵ دەکات. خاڵێکی گرنگ کە ئەبێ سەرنجی بدەینێ، ئەوەیە کە رەگەزی «چی» کام یەك لە بایەخەکانی هەواڵ دەگرێتەوە. بۆ وێنە ئەگەر رووداو هەڵگری بایەخی بەرفراوان و بەربڵاوی بێت ئەبێ هەوڵ بدەین لە لیددا باسی لێبکەین.

**بۆ وێنە:** کاتێ کە بانك رایدەگەیێنێ کە بەو کارمەندانەی عەقاری کرێنی خانووبەرە بەو کارمەندانە ئەدات کە زیاتر لە دە (١٠) ساڵ پێشینەیان هەیە. بایەخی بەرفراوان و بەر بڵاویی ئەم هەواڵە کارمەند و بنەماڵەکانیان دەگرێتەوە و راستەو خۆ کارتێکردنی هەیە لە سەریان، کە دەتوانین بەم شێوازە ئامادەی بکەین.

هەولێر – رۆژنامەی خەبات –

***سەرۆکی بانکی ناوەندی کوردستان ئەمڕۆ ڕایگەیاند کە لە ساڵی داهاتوودا بە سەرجەم فەرمانبەرانی دەوڵەت کە زیاتر لە ١٠ ساڵ پێشینەیان هەیە عەقاری کڕینی خانووبەرە ئەدرێت.***

*ئەو ڕەگەزانەی کە لەم هەواڵەدا هاتوون ئەمانەی خوارەوەن:*

*کێ؟* بانك

*کەی؟* لە ساڵی داهاتوودا

**چی؟** عەقاری بە فەرمانبەران

*بۆچی؟* کڕینی خانووبەرە

*چلۆن؟* لە لیدەکەدا باسی لێ نەکراوە

*لەکوێ؟* هەولێر

لەم نموونەیەدا بە ناوبانگی (بانك) یان ڕەگەزی «کێ»یە و بەرفراوانی و بەربڵاوی دانی وام بە کارمەندانی دەوڵەت هەر ئەو ڕەگەزەی «چی» بیە.

جیاوازی ئەم لیدە لەگەڵ ئەم نموونەیەی کە لێرەدا باسی دەکەین لەوەدایە کە بایەخی بەرفراوانی لە لیدەکەدا بە ڕوونی باسی لێنەکراوە.

دیاربەکر ـ گۆڤاری باران

**سەرۆکی بانك ئەمڕۆ ڕایگەیاند بۆ دانی وامی کڕینی خانووبەرە قسەوباس کراوە**

لەم لیدەدا بایەخی بەرفراوانی بە ڕوونی نەخراوەتە ڕوو و لە جۆری لیدی بێ ناوەڕۆکە.

*** بەرجەستە کردنەوەی ڕەگەزەکانی هەواڵ لە «لید»دا:**

لە کاتی نووسینی هەواڵدا دەتوانین بابەتەکان بە تەئکید کردنەسەر یەکێ لە شەش ڕەگەزی هەواڵ ئامادە بکەین و ئەمەش لە یاد نەکەین کە بە کام تەئکید و بەرجستە کردنەوە لە سەر بایەخەکانی هەواڵ دەتوانین خوێنەر بەرەو خوێندنەوەی هەواڵ ڕێنوێنی بکەین.



*** لیدەکانی خوارەوە بخوێننەوە و سەرنج بدەنە بەرجەستە بوونەوی ڕەگەزەکانی هەواڵ:**

- *لیدی «کێ»:* **وەزیری پۆستەخانە و تەلەفون لە سپاردنی ٢٠٠ هەزار ژمارە تەلەفون بە داخوازانی سەرتاسەری وڵات هەواڵی دا.**
- *لیدی «کێ»:* **ڕێکخراوی وڵاتانی بەرهەم هێنەری نەوت (ئوپێك) ڕادەی بەرهەمهێنانی ٩/٢٢ ملیۆن بەرمیلیان لە ڕۆژێکدا دیاری کرد.**
- *لیدی «لەکوێ»:* **ڕێگای مەریوان – سەرشیو بە هۆی بارینی دوو ڕۆژی ڕابردووەوە و هەڵکردنی لافاو داخراوە.**
- *لیدی «لەکوێ»:* **تورکیا وەکو گرانترین وڵات لە باری خەرجەوە بۆ گەشتیاران ناسێندرا.**
- *لیدی «کەی»:* **کاتژمێری ٣و١٠ دەقیقەی سەر لە بەیانی ئەمڕۆ بنکە و بارەگای تیرۆریستەکان درایە بەرموشەك.**
- *لیدی «کەی»:* **ساڵی داهاتوو، یاسای هەرنادە و هاتنەکان بەمەبەستی گەشە پێدانی بازرگانی دەگۆردرێ.**
- *لیدی «کێ»:* **گروپێکی چەکدار ٥٠ kg پلاتینیان لە کارخانەیەکی کیمیاوی لە نزیکەی مسکۆدا دزی.**
- *لیدی «لە کوێ»:* **سەقز لە ٢٤ سەعاتی ڕابردوودا بەپلەی ٢٤ی ژێر سفر، ساردترین شاری کوردستان بوو.**
- *لیدی «چی»:* **هێرشی فرۆکە بۆمب هاوێژەکانی کوردستان بۆ سەر فرۆکەخانەی ڕژێمی بەعس لەبەغدا.**
- *لیدی «بۆچی»:* **بە هۆی پێکدادانی دوو پاس لە ڕێگای مەریوان بۆ سەقز ١٠ کەس کوژران.**
- *لیدی «چلۆن»* **بە وتەکانی سەرۆك کۆمار، حەڤدەهەمین پیشانگای بازرگانی**

**نێونەتەوەیی کوردستان کرایەوە.**

ئەو لیدانەی کە لێرەدا باسمان لێکرد، هەموویان لە سەر بابەت و هەواڵێ ئەدوێن. بەڵام بەرجەستە کردنە و تەئکید کردنە سەر رەگەزەکانی هەواڵ لە هەموویاندا یەکسان نیە. ئەبێ ئەم خاڵە لەبەر چاو بگرین کە هیچ کاتێ سەرنووسەر بە رۆژنامەنووس ناڵێت بۆ هەواڵەکە لیدی «کێ» یان لیدی «چی» بنووسێ، بەڵکو ئەبێ رۆژنامەنووس بۆ خۆی بە ناسینی لایەنە جۆربەجۆرەکانی رووداوەکە، هەوڵ بۆ بەرجەستە کردنەوەیان بدات.

*** جۆرەکانی لید نووسین:**

١- **لیدی پرسیاری:** لیدی پرسیاری، بەپرسیارێکەوە دەس پێدەکات. ئەو پرسیارە ئەبێ وەها لە خوێنەر بکات کە بە شەوق و حەزێکی فراوانەوە هەواڵ بخوێنێتەوە.

**ئایا تاکو ئێستا بینیوتانە یارییەکی تۆپی پێ بە ٢١ گوڵەوە ئەنجام درابێت؟**

لەچوار چێوەی پێشبڕکێی یارییەکان کوردستان، دوێنێ تیمی «شارەزوور» بە ئاکامی ١٨ بە ٣ لە تیمی «گەرمیان»ی بردەوە.

**لیدی قسەگێڕانەوە:** گەر گرنگترین بەشی وتەکانی کەسێ لە پەرەگرافی یەکەمدا بنووسین لیدەکە ئەبێتە لیدێکی قسە گێڕانەوە. هەواڵنێر بۆ خۆی ئەبێ بڕیار بدات کە لە سەر چ شێوازێ ئەیەوێت بابەتەکان ئامادە بکات. قسە گێڕانەوە دووپات کردنەوەی بابەتی نووسراو یان وتراوی کەسایەتی و سەرچاوە هەواڵییەکانە کە بەسێ شێوە ئەنووسرێت.

*** قسەگێڕانەوەی راستەوخۆ:**

لە قسەگێڕانەوەی راستەوخۆدا، بابەت هەر بەو شێوەیەی کە باس کراوە ئەنووسرێتەوە. گەر بێتو قسەکان یان وتەکان گومانی تێدابێت قەت نابێ قسە گێڕانەوەی راستەوخۆ بە کار بێنن. بابەتێ کە بە شێوەی قسەگێڕانەوەی راستەوخۆ بە کار دێت ئەبێ بخرێتە نێو دووکەمانەوە.



**بەر پرسی گشتی بانکی ناوەندی وتی:**

«رادەی پاشەکەوتی دراوی وڵات لە سەدا ٣٠ زیادی کردووە».

١- کاتێ کە وێژەری قسەکان باس لە بابەتێ بکات کە جێی باس و لێکۆڵینەوە و داوەری بێت لەم کاتەدا هەواڵنێر ئەبێ تەواوی وتەکان بێ هیچ کەم و کورییەك لە نێو دووکەوانەدا بنووسێتەوە.

٢- کاتێ کە وێژەری قسەکان ئەیەوێ بابەتێکی سەرنج ڕاکێش و سەرسوڕ هێنەر باس بکات بە کار هێنانی قسەگێڕانەوەی راستەوخۆ لەم بابەتەوە کەسایەتی و شێوە بیرکردنەوەی وێژەری قسەکان نیشان ئەدات.

٣- کاتێ کە هەواڵنێر بیەوێ ئەو بابەت و وتانەی کە لە قسە گێڕانەوەکەدا هاتووە دیاری بکات قسەی خۆی نیە،بۆ دیاری کردنی سەرچاوەی هەواڵەکە، قسەگێڕانەوە بە کار دێنێ.

یاسای گشتی بۆ بەکارهێنانی قسەگێڕانەوەی راستەوخۆ ئەمەیە کە وتەکان بەو جۆرە کە وێژەری قسەکان باسی لێکردووە لە نێو دووکەوانەدا بنووسرێتەوە.

هەندێ جار ئەگەری ئەوە هەیە کە وتەکان لە باری رێزمانییەوە هەڵەی تێدا بێت، لەم حاڵەتەدا دەتوانین وتەکان راست کەینەوە بەڵام نابێ ئەم راست کردنەوەیە بێتە هۆی تێکدانی مانا و ناوەرۆکی قسەکان.

*** قسەگێڕانەوەی ناراستەوخۆ:**

لە قسە گێڕانەوەی ناڕاستەوخۆدا مانای بابەتی باس کراوی وێژەر، راست و روون و درووست ئەنووسرێتەوە، بەڵام بەم جیاوازییەوە کە وشەکان ئەوانەن کە وێژەری قسەکان وتوویەتی هەربەم بۆنەوەیە لە قسەگێرانەوەی ناڕاستەوخۆدا دووکەوانەدا بە کار ناهێنین.

**وەزیری وزە رایەگەیاند:**

***بە دارشتنی سەرمایەی نوێ لە بواری پیشەی کارەبادا تاکو پێنج ساڵی داهاتوو***

***سێ موەلیدی گەورە لە وڵات ساز دەکرێت.***

قسەکان ئەمە بووە: «**سێ موەلیدە تاکو پێنج ساڵی داهاتوو لە وڵاتدا سازدەکرێت**»

### ***- چ کاتێ قسە گێڕانەوەی ناڕاستەو خۆ بە کار دێنین؟***

١- کاتێ وێژەری قسەکان وشەی نامۆ و ناروون بە کار بێنێ و بۆ خوێنەریش ماناکەی گران بێت. لەم حاڵەتەدا وێڕای تێگەیشتن لە مانا و ناوەرۆکی قسەکان بە زمانێکی ساناتر و بە شێوەی قسەگێڕانەوەی ناڕاستەوخۆ بابەتەکان ئەنووسینەوە.

٢- کاتێ بابەتی وتراو سانا بێت و دوور و درێژ و وشەی زیادی تێدابێت.

٣- کاتێ کە هەواڵنێر متمانەی بە قسەکانی بێژەر نەبێت بەڵام لە ناوەرۆکی قسەکان گەیشتبێ.

*** لیدی مێژوویی:**

لەم لیدەدا وێڕای بیر هێنانەوەی پێشینەیەك لە رووداو و خستنە رووی مێژینەی بابەتەکە دەتوانین هۆگری خوێنەر زیاتر بکەین.

***١- یەك ملیۆن ساڵ لەمەو بەر کاتێ کە دوایین دایناسۆرەکان لە ناو چوون، زانایان بیریان نەدەکردەوە کە بتوانن ناو نیشانێ لەم بوونەوەرانە لە ناوچەی سیبریدا بدۆزنەوە.***

***٢- ٢٥ ساڵ لەمەوپێش پیاوێك، ژنەکەی لەبەر چاوی خەڵکەوە لە شەقامی شانازی ورمێ دایە بەر قەمە و کوشتی، بەڵام دوێنێ پۆلیس ئەم پیاوەی لە تەمەنی ٦٥ ساڵاندا لە دوورگەی «هنگام» قۆڵ بەست کرد.***

**** لیدی شیکراوە و شرۆڤەیی:***

باوترین جۆری لید کە لە هەواڵگەلی رامیاری و ئابووری و راپۆرتە هەواڵەکاندا بە کار دێت لیدی شیکراوە و شرۆڤەیی‌یە ئەم لیدە بە پێی زانیاری‌یە بە دەست هاتووەکان سەبارەت بە هەواڵ ئامادە دەکرێت و زانیاری‌یەکان ژێرخانی ئەم لیدە پێك دێنن. لەم لیدەدا رۆژنامەنووس بە پشتیوانی زانیاری و ئاگاداری رووداوە



هەواڵی‌یەکانی پەیوەند بە یەکتر، بە پێی لێکدانەوەکانی لە ناوەرۆکی رووداوەکان دەگات و لیدێکی شیکراوە و شرۆڤەیی پێشکەش خوێنەران دەکات.

▪ **منداڵێکی حەوت ساڵان کە حەوتەی رابردوو لە جەنگەڵستانەکانی باکووری ئێران ون ببوو، لە حاڵێکدا کە لە ترس و برسییەتیدا دەگریا لە ناوچەی مەرزەن ئاوا دۆزرایەوە.**

*** لیدی وەسفی:**

لە لیدی وەسفیدا هەواڵنێر لە رێگەی وشە وەسفییەکانەوە هەوڵ بۆ وروژاندنی هەستی خوێنەر ئەدات. لەم لیدەدا بە پێی جۆری رووداوەکە هەواڵنێر دەست ئەداتە وەسف کردنیان.

دڵت بە چی خۆشە شۆڕە سواری لە چۆلگە جێ ماوی وڵاتەکەم، بە پێڵاوی زنجیر بەستراوت، بە گۆنای سورمە نەخشاوت، بە چی؟ بڕوات ببێ ئەم هەرێمە قەت تۆ لە یاد ناکات، چونکو تۆ یادگاری بە جێ ماوی مەستوورە و ئاویەری گیانمانی.

*** لیدێ کە بە قسەی نەستەقەوە دەس پێدەکات:**

لەم لیدەدا ئەبێ قسە نەستەقەکە لەگەڵ رووداودا پەیوەندی ببێت و بتوانێ بابەتی رووداوەکە بە جوانترین شێوە بخاتە روو.

*** لیدی پێرستی:**

لە هەندێ لە رووداوەکاندا چەند بابەتی گرنگ و هاوسەنگ و یەکسان لە باری بایەخەکانی هەواڵەوە هەیە کە بە شێوەی پێرستی دەتوانین لە لیدەکەماندا بینووسین.

وەفدی دەوڵەت لە دانشیتنی ئەمڕۆی خۆیدا چەند بڕیاری گرنگی پەسەند کرد:

- **دانی وامی خانووبەرە بە مامۆستایان**
- **پەسەند کردنی زیاد بوونی ماڵیاتی پیشەگەران**
- **زیاد کردنی پاسەکانی نێوشار**

*** لیدی هەڵسەنگاندنی:**

لەم لیدەدا باس لە جیاوازی و هاوشێوەیی دوو رووداو ئەکرێت و دوو بابەت بەرامبەر بەیەك هەڵئەسەنگێت.

*** لە حاڵێکدا سلێمانی بە ئاو وهەوای بەهاریەوە، رۆژانی زستان تێدەپەڕێنێ، گوندەکانی ناوچەی مەریوان بە هۆی بارینی یەك مەتر بەفرەوە گەمارۆ دراون.**

*** لە حاڵێکدا کۆماری ئیسلامی باس لە هاریکاری هەمە لایەنە لەگەڵ کوردستان دەکات، تاقمێکی تیرۆریست بە پشتیوانی ئێران ئاسایشی کوردستانیان خستوەتە مەترسیەوە.**

*** لیدی سانا و لیدی قووڵ:**

لەم لیدەدا بە هۆی ئەوەیکە وڵامی رەگەزەکانی هەواڵ دیاری ئەکرێت، بە شێوەیەکی سانا و راستەوخۆ گرنگترین بەشی هەواڵ باس ئەکرێت. بەم جیاوازیەی کە لە لیدی قووڵدا زانیاریەکی زیاتر سەبارەت بە رووداو ئەخرێتە روو، کە درێژترە لە لیدی سانا.

*** لیدی سانا**

**پەرلەمان یاسا و رێسای گۆڕینی تەڵاقی پەسەند کرد**

*** لیدی قووڵ**

**پەرلەمانی کوردستان یاسا و رێسای گۆڕینی تەڵاقی بە زیاترین دەنگەوە پەسەند کرد و بە پێی ئەم یاسایە ژنانی تەڵاق دراو، لە مڵك و سامانی هاوسەرەکانیان بەشبەر دەبن.**

*** چەند خاڵێکی گرنگ کە لە نووسینی لیددا ئەبێ رەچاوی بکەین:**

١- لیدی هەواڵ ئەبێ لە ٤٠ وشە زیاتر نەبێت.

٢- لیدی هەواڵ لە دوو رستە زیاتر نەبێت.

٣- لیدی هەواڵ ئەبێ هەڵگری گرنگترین بابەتی رووداو بێت

٤- لە سەرەتای لیددا زەمان و شوێن بە کار مەهێنن، مەگەر ئەوەی کە زەمان و شوێنی هەواڵەکە گرنگیەکی تایبەتی ببێ.

٥- بە کار هێنانی وشەی «ئەمرۆ» لە لیدی هەواڵدا، هەواڵەکە تازەتر دەنوێنێ.

٦- لە شێوازی ئامادە کردنی هەواڵ لە سەر شێوازی هەرەمی سەروژێر کراو و مێژوویی لەگەڵ لیددا، بابەتی لید و مانشێتی هەواڵ ئەبێ لەگەڵ یەکدا هاودەنگ بێت.



## سەرچاوەکان


١- رۆژنامەگەری، نووسینی: دوکتور کازمی موعتەمەیدنەژاد. تاران، ناوەندی چاپی سپهر ١٣٦٨

٢- رۆژنامەگەری نوێ نووسینی: نەعیم بەدیعی و حسەین قەندی چاپی دووهەم، چاپی زانکۆی تەباتەبایی. تاران ١٣٨٠ کۆچی هەتاوی

٣- هەواڵ، نووسینی، یونس شوکرخاو ناوەندی پەرە پێدانی فێرکاری میدیاکان، تاران ١٣٧٤ کۆچی هەتاوی

٤- گۆڤاری لێکۆڵینەوە وتوێژینەوەی وتاری بنەما و شێوازەکانی نوێی هەواڵ نووسین، نووسینی ئۆمێدی مەسعودی. لاپەڕەی ١٤٥، ساڵی هەشتەم ژمارەی ٢٧. گەلاڕێزانی ١٣٨٠

٥- هەواڵنێری و هەواڵ گەیاندن لە رادیۆو تەلەفزیۆندا. نووسینی: حوجەتوڵا عەباسی. چاپی سروش تاران. ١٣٨٠

نامیلکەی فێرکاری شێوازەکانی هەواڵ نووسین. دوکتۆر مێهدی فۆرقانی وانەی رۆژنامەگەری (١) کۆلیژی کۆمەڵناسی تاران ١٣٧٧